د. عبدولعەزیز سطام عەبدولعەزیز ئال سعود
وەرگێڕانی: نزار لەتیف ئەحمەد



# پلەبەندیی مەبەستە شەرعییەکان

## لێکۆڵینەوەیەکی سیستمیی بنەماڵۆزی




لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٥٩)

پلەبەندیی مەبەستە شەرعییەکان
د.عەبدولعەزیز سطام عەبدولعەزیز ئال سعود

**ئەم کتێبە:**

مرۆڤ چەندین مەبەستی بێ کۆتا و گۆڕاوی هەیە لە بیروباوەڕ و کردار و هەڵسوکەوتە رۆژانەییەکانیدا، ئەم مەبەستانەش لە ڕووی چەندێتی و چۆنێتییەوە جیاواز و جۆراوجۆرن، بەپێی کات و شوێن و کەسەکان گۆڕانکارییان بەسەردا دێت. لە بنیادنانی ئەم مەبەستانەی مرۆڤ لەسەر مەبەستە نەگۆڕەکانی شەریعەت و بەڵگەکانی، هەروەها لە کار کردن بە بەرژەوەندییە پەسەندەکان (المعتبرة) تازەگەریی دێتەکایەوە. خودای یاسادانەر سیستمگەلێکی جێگیری داناوە لە مەبەستەکانی یاسادانان، مەبەستەکانی مرۆڤیش سیستمگەلێکی گۆڕاون؛ بەڵام تازەگەریی لە دۆزینەوە و کار پێکردنی یاسا شەرعییەکان و پەیوەندی نێوان ئەم دوو سیستمە سەرهەڵدەدات.

ئەم لێکۆڵینەوەیە دەربارەی دابەشکردنە جۆراوجۆرەکانی مەبەستە شەرعییەکان دەدوێت، سروشتی سیستمی مەبەستە شەرعییەکان و پلەبەندیی و پەیوەندیی نێوانیان و پەیوەندیی نێوان مەبەستە گۆڕاوەکانی شوێن و کات و بارودۆخی مرۆڤەکان دەخاتە روو، بە رەچاوکردنی ئەو دەوروبەرەی کە مەبەستەشەرعییەکان کاری تێدا دەکەن، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم کتێبە روونکردنەوەیە بۆ: سروشتی پلەبەندیی مەبەستە شەرعییەکان و پەیوەندیی نێوانیان و پەیوەندیی نێوانیان و داکەوتە و گۆڕاوەکانی دەوروبەریان.

نرخ: (٢٢٥٠ دینار)



# پلەبەندیی مەبەستە شەرعییەکان

## لێکۆڵینەوەیەکی سیستمیی بنەمادۆزی

نووسینی: د.عەبدولعەزیز سطام عەبدولعەزیز ئال سعود

وەرگێڕانی: نزار لەتیف ئەحمەد

# پلەبەندییەکانی مەبەستە شەرعییەکان

## لێکۆڵینەوەیەکی سیستمیی بنەمادۆزی

.......................................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٥٩)


- نووسینی: د. عەبدولعەزیز سطام عەبدولعەزیز ئال سعود
- وەرگێڕانی: نزار لەتیف ئەحمەد
- بابەت: ئایینی
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد.
- چاپ: یەکەم ٢٠١٨ ـ ناوەندی ڕێنوێن.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٩٣٠)ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە.

# ناوەڕۆك

# پوختەی لێکۆڵینەوە

مرۆڤـــەکان مەبەســـتگەلێکی بێکۆتایـــان هەیـــە، کـــە تـــەنها لـــە بیروبـــاوەڕ و کردارەکانیانـــدا خـــۆی نابینێتـــەوە، لـــە ڕووی چـــەندێتی و چـــۆنێتییەوە جیـــاواز و جۆراوجۆرن. لە بنیادنانی مەبەستە گۆڕاوەکانی مرۆڤ لەسەر مەبەستە نـەگۆڕەکانی شەریعەت و بەڵگەکانی، تازەگەری بە بەرژەوەندییە پەسەندەکانەوە دەکەوێتە کار، ئەوەتا یاسادانەر سیسـتمێکی وردی دانـاوە بـۆ مەبەسـتەکانی یاسـادانان. ئەمـەش لەخۆیدا جێگیرە، بەڵام تازەگەری لە دۆزینەوە و کارپێکردنیدا دەکرێـت. مەبەسـتی مـرۆڤیش بـۆ خـۆی سیسـتمێکی گـۆڕاوی هەیـە و لـە پەیوەنـدیی نێـوان ئـەم دوو سیسـتمەوە، دیـاردەی تازەگـەری سـەر هەڵـدەدات. ئـەم لێکۆڵینەوەیـە دەربـارەی دابەشکردنە جۆراوجۆرەکانی مەبەستە شەرعییەکانە[1] و لێکۆڵینەوەیـە لـە سروشـتی پەیوەنـدیی پێکهێنـــەرەکانی مەبەســـتە شـــەرعییەکان لـــەناو خۆیانـــدا و وەســـفی سروشتی کارلێککارییان و پەیوەندییان بە دەوروبەری پەیوەست پێیانەوە، ئەمەش بە تێڕامان لە جەوهەر و ڕووکەش و پلەبەندی و سیستمیان.

---

[1] وەرگێـڕ وەك پابەندییـەك بـە بنـەماکانی وەرگێڕانـەوە، لـە تـەواوی وەرگێڕانەکـەدا دەسـتەواژەی (مەبەستە شـەرعییەکان)ی بـەکار هێنـاوە، بـۆ ئـەوەی تێکسـتەکە تێك نەچێت، یـاخود دەسـتکارییەك نەکرێت کە لە نووسینەکە بەو جۆرە نییە. بەڵام بـەکارهێنانی دەسـتەواژەی (مەبەسـتەکانی شـەریعەت) گونجاوترە لـە دەسـتەواژەی (مەبەسـتە شـەرعییەکان)، چـونکە مەبەسـتە شـەرعییەکان سـەرجەم ئـەو مەبەستانە دەگرێتەوە کە مرۆڤ بە مەبەستی نزیکبوونەوە لە خودا دەیخاتە پاڵ کردەوەکانی، لە کاتێکدا مەبەستی نووسەر لە تەواوی ئەم بابەتـە، قسـەکردنە لەسـەر مەبەسـتەکانی شـەریعەت، کـە بـریتین لـەو مەبەستانەی شەریعەتی ئیسلامی هاتووە بۆ بەرپاکردن و پاراستن و گەشەپێدانیان.

# پێشەکی

ستایش بۆ خودای بەدیهێنەر و ڕێکخەر، ئەو خودایەی ئەندازەگیریی کردووە و ڕێنمونی بەخشیوە، ستایش و سوپاسی دەکەم لە نهێنی و چرپەدا و گەواهی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لەوی بەرز و بڵند، گەواهی دەدەم گەورەمان محەمەد(دروودی خوای لەسەر بێت) بەندە و نێردراوی ئەوە.

**پاشان:**

مەبەستە شەرعییەکان پشکێکی باشیان هەبووە لە چاودێریی زانایان بۆ دابەشکردن و پلەبەندییان، ئامانج لەمەش یارمەتیدانە لە تێڕامانی سەرەتایی و بەراوردکردنی لە نێوان بەرژەوەندی و خراپی لە لایەك و پلەبەندیی بەرژەوەندی و خراپەکان لەخودی خۆیاندا لە لایەکی ترەوە، ئەمەش پاڵنەر بوو بۆ دابەشکردنی مەبەستەکان لە لایەنی جیاوازەوە وەك جۆراوجۆری و چەندایەتی و کارلێك و بارەکانیان. مرۆڤەکانیش مەبەستی بێ سنووریان هەیە لە بیروباوەڕ و کردارەکانیان، ئەم مەبەستانە جۆراوجۆر و جیاوازن. هەندێ کەس بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ مەبەست و بیروباوەڕی بە بەڵگەی دروست لە شەریعەت، هەندێکیش دەگەڕێت بۆ هێنانی ئەو بەڵگانەی لەگەڵ حەزەکانی دێتەوە و ئەو بەڵگانە دوور دەخاتەوە کە لەگەڵ ئارەزووەکانیدا نییە بۆ بیانووهێنانەوە بۆ تێکڕای بیروباوەڕ و هەڵسوکەوتەکانی[١].

لە بونیادنانی مەبەستە گۆڕاوەکانی مرۆڤ لەسەر بەڵگە شەرعییەکان و مەبەستە نەگۆڕەکانی، تازەگەری دێتە پێش لە کارکردن بە بەرژەوەندییە پەسەندەکان.

---

[١] بۆ زانیاری پتر دەربارەی هەڵەی بەڵگەهێنانەوەی بۆ پشتیوانی، بڕوانە:

John S. Hammond, Ralph L.Keeney, and Howard Raiff, The Hiden Traps in Decision Making Harvard business review, September – October, 1998.

یاسادانەر سیستمێکی مەبەستیی یاسادانانی وردی داناوە، کە ئەمەش نەگۆڕە و دووبارە دەدۆزرێتەوە و کاری پێ دەکرێت، مەبەستەکانی مرۆڤیش سیستمێکی گۆڕاوی هەیە. لە ڕێی پەیوەندیی نێوان دوو سیستمەکەوە، رووی تازەگەری دەردەکەوێت[١].

ئەوەی ئیشکالییەتی دروست کردووە لای زانایان، دابەشکردنی مەبەستە شەرعییەکانە و هەمیشەش بانگهێشتیان دەکات بۆ پێداچوونەوە بە دابەشکردنەکانیدا، بریتییە لە بەیەکداچوونی –تێکەڵبوونی– مەبەستەکان لەناو خۆیاندا. مەبەستێك جیا نابێتەوە لە هاوتاکەی، دووبارە دەچێتە ژێر مەبەستێکی باڵاترەوە کە دەبێتە بەشێك لێی، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەر تاکێك لە تاکەکانی مەبەستەکان، کارتێکراوە بە سەرجەم تاکەکانی تری مەبەستەکان و کاریشیان تێ دەکات، هەروەها بونیادنانی مەبەستەکان لەسەر بەرژەوەندییە پەسەندەکان دەبێت و ئەمیش بە گۆڕانی کات و شوێن و بار و کەسەکان دەگۆڕێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی هەر دابەشکردنێکی مەبەستە شەرعییەکان، بە شێوازی ڕێگەپێدراوی دیکە دووچاری دووبارە دابەشکردنەوە ببێت، جا شێوازەکە بەکار بهێنرێت و هەبێت، یان دابەشکردنێکی تازە بێت. رووە شەرعییە پەسەندەکانی مەبەست و بەرژەوەندییەکانیش زۆر و جۆراوجۆرن، ئەمەش رێخۆشکەرە بۆ دابەشکردن و جۆراوجۆریی بێ سنووریان[٢].

---

[١] بڕوانە: عبد الله بن بیە، گفتوگۆیەك دەربارەی پەرتووکە نوێیەکەی(( مشاهد من المقاصد)) الرسالە، http:www.binbbayya.net/portal/dialogues/446 /25/2/1435 هـ

[٢] فرەجۆری دابەشکردنەکان بە بێ سنوور تەنها لە مەسڵەحەت و مەبەستەکاندا نیە، بەڵکو هەموو بەرهەمە هزرییە مرۆییەکان دەگرێتەوە، بەڵام ئەوەی پشتی پێ دەبەسترێت نەگۆڕ و بنەماکانی شەرعن کە گۆڕان و جێگۆڕکێیان بەسەردا نایەت، بەڵام گۆڕەپانی ئیجتیهاد فراوانە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر کامڵیی ئاین و پڕاوپڕیی نیعمەتی خوداوەندی.

بۆیە هەر بەرژەوەندییەکی پەسەند کە مەبەستێکی شەرعیی لەسەر یاخود بۆ بونیاد دەنرێت، دەکرێت دابەش بکرێت بۆ چەند بەشێك، دەکرێت مەبەستە شەرعییەکان دابەش بکرێن بەگوێرەی ئەو بەشە پەسەندانەی بەرژەوەندییە رەچاوکراوەکانی شەریعەت. ئەم بەشانەش دەکرێت دابەش بکرێن بۆ بەشی بچووکتر و بچووکتریش لەوان. بەشوێن ئەمەشدا، دابەشکردنی مەبەستەکان دێت بەپێی بەشەکانی بەرژەوەندییەکان، بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت تا دەگاتە ئەوەی چیدی لە توانادا نەبێت دابەشیان بکەین، یان دابەشکردنەکەی سوودی نییە، لێرەدا دابەشکردنەکە دەوەستێت لەبەر بێسوودی یان لە توانادا نەبوونی.

پاشان وێناکردنی مەبەستەکان و بەرژەوەندییەکان وەك شتانێکی نەگۆڕ لە قاڵبێکی چەسپاودا، بەگوێرەی دابەشکردنەکانی بە شێوازی جۆراوجۆر، کارێکی بەسوودە بۆ لێکۆڵینەوە و روونکردنەوە، بەڵام ئەمە رەنگدانەوەی واقیعی گۆڕاوی بەرژەوەندی و مەبەستەکان نابێت، چونکە بنەڕەتەکەی جوڵاو و گۆڕاوە، چونکە لەسەر پایەی کارلێك لەگەڵ بارودۆخی مرۆڤایەتی وەستاوە و کاریگەرە بە گۆڕاوەکانی واقیعی کات و شوێن و بار و مرۆڤە موکەللەفەکان، هەر بۆیە لێکۆڵینەوەی لایەنی جێگیریی، لە لێکۆڵینەوەی وێنەی بەرژەوەندی و دابەشکردنەکانی مەبەستەکاندا نابێت، چونکە ئەمەیان گۆڕاوە، بەڵکو بە لێکۆڵینەوەی پەیوەندیی نێوان بەرژەوەندی و بەرژەوەندی، پەیوەندیی نێوان مەبەستەکان و مەبەستەکان، پەیوەندیی نێوان مەبەست و بەرژەوەندی، چونکە ئەوە لایەنێکی جێگیرە که دووبارە دەدۆزرێتەوە و کاری پێ دەکرێت.

وا باشترە دەروازەی لێکۆڵینەوەی پەیوەندیی نێوان بێژەکان(مفردات) و پێکهاتەیی(المرکبات)ی مەبەستە شەرعییەکان زیاد بکەین و کورتی نەکەینەوە تەنها لە لێکۆڵینەوەی دابەشکردنەکانی مەبەستە شەرعییەکان، هەروەها بونیادنانی

تێگەیشتنێکی تەواو بۆ پلەبەندییە فیقهییەکان و پەیوەندییە بینراوەکانی نێوانیان و کۆکردنەوەیان لە سیستمێکی تەواودا، چونکە شەریعەتی ئیسلامی گشتێکی جیانەکراوەیە لەیەك و هەر کردارێك یان بەرژەوەندییەك بەدی دەهێنێت یان هەر خراپەیەك دوور دەخاتەوە. یاخود باوەڕبوون بەوەی ئەمە مەبەستێکی شەرعییە، لەوەوە دێت کە حوکمێکی خوایە لە سەرەتادا و بڕیاری لەسەر داوە لە کۆتاییدا. دابەشکردنەکانی مەبەستەکان و بەرژەوەندییەکانیش وەك ئەمە نین و لەسەریشیەوە نین، چونکە شەریعەتی خوا حاکمە بەسەر هەموو شتێکدا، ئەمەش هەموو بەرژەوەندی و هەڵسوکەوت و مەبەست و ئامانجێك دەگرێتەوە و ناکرێت بەش بەش بکرێت.

## گرنگیی لێکۆڵینەوەکە

گرنگیی لێکۆڵینەوەکە لە وێناکردنی مەبەستەکاندایە، وەك سیستمێکی تەواو نەك تەنها چەند کۆمەڵێکی جودا، دەرخستنی ئەوەی شەریعەی ئیسلامی گشتێکی تەواوە و دابەشکردن وبەشکردن وەرناگرێت و ئەوەی کە هەر بێژە (مفردە)ێك لە بێژەکانی مەبەستە شەرعییەکان، کارتێکەر و کارتێکراوە بە مەبەستەکانی تر.

ئەم تایبەتمەندییە لە مەبەستەکان، بە تێڕوانینێکی گشتیی گشتگیر لێی نەکۆڵراوەتەوە، زۆرینەی لێکۆڵینەوەکان سەیری ئەوبەشانەی کردووە کە لای لێکۆڵەر گرنگترین بووە —کە هەموویان گرنگن— و پاشان سەرقاڵبوون بە دابەشکردن و دووبارە پلەبەندی بەگوێرەی گرنگی، لە کاتێکدا ئەم لێکۆڵینەوەیە تایبەتە بە پەیوەندیی نێوان مەبەستەکان و واتاکانیان، ئەمەش لایەنێکی نوێیە تیایدا و لایەنە گرنگەکەشیەتی.

## بابەتی لێکۆڵینەوە

ئەو پرسیارە سەرەکییەی کە ئەم لێکۆڵینەوەیە لەدەوری دەخولێتەوە، بریتییە لە سروشتی سیستمی مەبەستە شەرعییەکان و پلەبەندیی و پەیوەندیی نێوانیان، پەیوەندیی نێوان مەبەستە شەرعییەکان و گۆڕاوەکانی شوێن و کات و بارودۆخ و مرۆڤە موکەللەفەکان، ئەویش ئەو دەوروبەرەیە کە مەبەستەکان کاری تێ دەکەن. لەم بوارەشدا دەکرێت بابەتی لێکۆڵینەوەکە بەم شێوەیە دابڕێژینەوە لە پرسیارێکی ناوەندیدا: سروشتی پلەبەندیی مەبەستە شەرعییەکان چۆنە؟ پەیوەندیی نێوانیان چۆنە؟ پەیوەندیی نێوانیان و گۆڕاوەکانی دەوروبەریان چۆنە؟ لەم پرسیارە سەرەکییەدا، ئەم پرسیارە پلەدووییانە دەکەونەوە:

١- مەبەستی مەبەستەکان چییە؟ مەبەست لێی چییە؟ چۆن؟ بۆچی؟

٢- سوود و بەرهەمی پلەبەندیی مەبەستە شەرعییەکان چییە؟

٣- ئایا پەیوەندیی نێوان مەبەستەکان خۆیان و مەبەستەکان و گۆڕاوەکانی دەوروبەری، لە یەك ئاستدان، یان ئاستی جیاوازیان هەیە؟

٤- ئایا ئەم پەیوەندییە هەرەمییە یا ئاسۆییە؟ جێگیرە یان گۆڕاوە؟

٥- ئایا ئەم پەیوەندییە رێك دەخرێت بە سیستمێکی کراوە یان داخراو؟

٦- کام لەم گۆڕاوانە سەربەخۆن و کامیان شوێنکەوتوون و کامیان نێوەندگیرن؟ کامیان زیاد لە رۆڵێکیان دەبێت؟

٧- بەرژەوەندییە پەسەندەکان بە چ رۆڵێك هەڵدەستن، سەبارەت بە مەبەستەکان؟

## پرۆگرامی لێکۆڵینەوە

ئـەم لێکۆڵینەوەیـە بەدواداچـوونێکی سیسـتماتیکیی بنچـینەییی شـیکارییە بـۆ مەبەسـتە شـەرعییەکان، مەبەسـت لـە بنچـینەیی، بـەپێی بـەکارهێنانی زانایـانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی(اصـول الفقـه)ە کـە بـە واتـای (بەڵگـە بـۆ هێنانەوە)یـە، چونکە واتای (اصول الفقه) بریتییە لە بەڵگەکانی (الفقه[1]). الفیومی دەڵێت: "اصلته تاصيلا." واتە بنچینەیەکی جێگیرم بۆ دانا، کە بابەتی تری لەسەر بونیاد بنرێت، و اصُّلَ الشيءَ: بنچینەیەکی جێگیری بۆ دانا کە بونیادی لەسەر بنرێت، بەمەش واتای بنچینەیی دەبێتە: گێڕانەوەی وتە و کردار بـۆ بنچـینە و بنـەڕەتێك کـە رێککـەرەوە بێـت و بینـای لەسـەر بکرێـت[2]. مەبەستیشـمان بریتییـە لـە ئەنجامـدانی سـەرجەم کردارەکـان بـەگوێرەی بنچـینە، واتـا بەڵگـەی شـەرعی، بـەم جـۆرە مەبەسـت لـە بنچـینەیی لـەم لێکۆڵینەوەیـەدا دەبێتـە: ئەنجامـدان و گێڕانـەوەی سـەرجەم پلەبەندییەکانی مەبەستە شەرعییەکان بۆ لێکەوتە بنچینەیییەکان(مقتضـى الاصـل) و پاککردنەوە و دەرهێنانی جێی بەڵگە شەرعییەکان.

---

[1] بڕوانە: ابن قدامة، موفق الدين عبد الله بن أحمد، روضة لناظر وجنة المناظر، اعتنى به وعلق عليه محمد مرابي، مؤسسة الرسالة ناشرون، دمشق،ط١، ١٤٣٠هـ ـ ٢٠٠٩م. هـەروەها بڕوانـە: الشـيرازي، أبـو اسـحاق ابراهيم، تحقيق عبد المجيد التركي، ط١، بيروت، دار الغرب الإسلامي، ١٤٠٨هـ ـ ١٩٨٨م. هەروەها بڕوانە: الجويني، امـام الحـرمين عبـد الملـك بـن عبـد الله، البرهـان في أصـول الفقـه، ط الأولى، مصـر، المنصـورة، دارالوفاء، ١٤١٢هــ ـ ١٩٩٢م. وە: الآمـدي، الإحكـام في أصـول الأحكـام، تعليـق: عبـد الـرزاق عفيفـي، ط الثانية، بيروت ـ المكتب الإسلامي، ١٤٠٢هـ ـ ١٩٨٢م.

[2] بڕوانە: الفيومي أبو العباس أحمد بن محمد بن علي الفيومي الحموي، المصـباح المـنير في غريـب الشـرح الكبير ، مـادة(ا،ص،ل)، مخطـوط، المكتبـة الأزهريـة، نسـخ، عبـد الـبر بـن محمـد أبـو اليسـر السـيوطي، بتاريخ١٠٩١هـ.

هەرچی پرۆگرامی سیستمیشە، ئەوە شێوازی بیرکردنەوە و تێڕامانی بابەتەکەیە لە روانگەی سروشتی کارلێك و پلەبەندیی مەبەستە شەرعییەکانەوە و پەیوەندیی نێوان پێکهاتە ناوخۆییەکانیەتی لەناو خۆیاندا و لەگەڵ دەوروبەری پەیوەست پێیانەوە ـ بە مەبەستە شەرعییەکانەوە ـ.

میتۆدی شیکردنەوە(تحليلي)ش گونجاوە لەگەڵ لێکۆڵینەوە لەم بابەتە، بە هۆی بوونی لێکۆڵینەوەی پێشتر لە هەمان بواری مەعریفی(المجال المعرفي)دا، کە ڕێخۆشکەری لێکۆڵینەوەی ناوەرۆکی بەشێکی باشیەتی، بۆ دەرخستنی لایەنی گشتگیری بە شێوەیەك کە ببێتە هۆی زانینی وردتری، کە ئەمەش یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن و وێناکردنێکی باشتری پلەبەندیی فیقهیی مەبەستە شەرعییەکان.

بەم شێوەیە دەبێت پەیوەستبوون بە رێساکانی مەنهەجی بنچینەییی سیستمی و شیکاری لە وێناکردنی پەیوەندیی نێوان پێکهاتەکانی پلەبەندیی مەبەستە شەرعییە ناوخۆییەکان لەناو خۆیاندا و وەسفکردنی پەیوەندییان بە هۆکارە دەرەکییەکانی پەیوەست پێیانەوە، کێشانی هێڵکاری بۆ سیستمی پلەبەندیەکانی مەبەستە شەرعییەکان و روونکردنەوەیان بەپێی لێکەوتە بنچینەییەکان، واتا بەڵگەی شەرعی.

## پلانی لێکۆڵینەوەکە

ئەم لێکۆڵینەوەیە پێك دێت لە پێشەکی و خستنەڕووی پوختەی بابەتی لێکۆڵینەوە و وەسف و دیاریکردنی پرۆگرام و ناساندنی بابەتی لێکۆڵینەوە. پاشان بەشی یەکەم کە (دابەشکردنی مەبەستە شەرعییەکان)ە، و پاشان بەشی دووەم (مەبەستە شەرعییەکان بەگشتی)، ئەنجا بەشی سێیەم (مەبەستی شەرعیی ڕەها) دێت، پاشان بەشی چوارەمە کە (سیستمی پەیوەندیی نێوان مەبەستەکان)ە و کۆتاییی لێکۆڵینەوەکە دێت بە دەرئەنجامەکان و کۆتایی.

# بەشی یەکەم
# دابەشکردنی مەبەستە شەرعییەکان

پێش خستنەڕووی دابەشکردنەکانی مەبەستە شەرعییەکان، دەستپێکی ئەم بەشە دەکەینە پێناسەی مەبەستەکان.

مەبەستەکان(المقاصد) لە زمانەوانیدا: کۆی مەبەست(مقصد)ە، ئەمیش لە بنچینەی (قصد یقصد قصدا)ە و بنچینەی (ق ـ ص ـ د) و شێوازەکانی لە زمانی عەرەبیدا: الاعتزام، التوجه، النهود، النهوض نحو الشئ علی اعتدال کان ذلك او جورا. واتە (نیەتهێنان، رووتێکردن...، هەستان بەرەو شتێك، جا بە دادگەری بێت یان ستەمکارانە)، ئەمە بنچینەیەتی لە راستیدا، هەرچەندە لە هەندێك شوێندا تایبەت دەکرێت بە مەبەستی راستڕەوی و لانەدان. مەبەست(القصد) بە چەند واتایەك بەکار دەهێنرێت، لەوانە: چوون بۆ شتێك، راستیی ڕێگە –خوارنەبوونی–، پشتپێبەستن، پێشکەوتن، دادگەری، شکان لە هەر روویەکەوە بێت[1].

---

[1] بڕوانە: باب (قصد) في الزبيدي، السيد محمد مرتضى الحيسني، تاج العروس من جواهر القاموس، تحقيق، عبد الكريم العزباوي، راجعه: مصطفى الحجازي، الكويت، مطابع الحكومة، ١٤١٠هـ ـ ١٩٩٠م، ج٩

له زاراوەدا: زانایان واتـای مەبەست(المقصـد)یان دیـاری نـەکردووە لـە زاراوەدا، سـەرەڕای دەستنیشـانکردنی چـەند مەبەسـتێك لـە نووسـینەکانیاندا، هەنـدێك لـە دابەشکردنەکانیان باس کـردووە: وەك باسـکردنی گشـتی کـە پێـنج مەبەسـتەکەن: (پاراسـتنی ئـایین و گیـان و ژیـری و وەچـە و سـامان)، باسـکردنی بەرژەوەندییـە (الضروري و الحاجي و التحسيني)ەکان و هەندێك دانایی و نهێنی و هۆکار، هـەروەك دەربڕینی مەبەستەکان بە دەربڕینی جیاواز و جۆراوجۆر کە ئاماژەن بـۆی، ئەمـەش لە تێکستەکاندا دەردەکەوێت، هەندێکیان دەریانبڕیوە بـە داناییيـەکی ویسـتراو کـە یاسادانەر دایناوە لە شەریعەدا، هەندێکیان وشەی بەرژەوەندییان بۆ بەکار هێناوە، لـە هەنـدێك شـوێندا بـە دوورخسـتنەوەی زیـان و هـەڵگرتنی و بـڕینی هـاتووە، هەنـدێکیان پێیـان وتـووە پاڵنـانی گرانـی و قورسـی و هـەڵگرتنی یـان هـەڵگرتنی ناڕەحەتی و تەنگی و بڕیاردانی ئاسانکاری و سوککاری، هەندێك جـار نـاوی دەبـەن بـە پێـنج گشـتگیرە گەورەکـە، وەك پێشـتر ئاماژەمـان پـێ دا، هەنـدێك جـار بـە هۆکارەکان(عیللەتەکان) و هەندێك ناوی تریش[1].

---

ص٣٥. وە: ابن منظور أبو الفضل جمال الدين محمد بن مكرم بن منصور١٤١٤هت ١٩٩٤م، لسان العرب، ط ٣، بيروت، دار صادر، ج٣، ص٣٥٣.

[1] الخادمي، نور الدين بن مختار، الاجتهاد المقاصـدي، حجيتـه، ضـوابطه، مجالاتـه، الطبعـة الأولى، قطـر، وزارة الاوقاف والشؤون الإسلامية، ١٩٩٨م، ج ١، ص٤٨، علم المقاصد الشرعية، مرجع سابق، ١٥، فـارس العزاوي، مدخل الى علم المقاصد (٢/٥) المصدر: شبكة الانترنت: موقع:
htt://www.alukaj.net/sharia. 6155 ،01.م٢٠١٤م٠١م

(الشاطبي) یەکەم کەسە باسی ئەمەی کردووە، کە دەڵێت: "مەسەلەی حەوتەم: کەواتە سەلمێنرا کە یاسادانەر، مەبەستی لە یاسادانان، بەرپاکردنی بەرژەوەندیی دونیا و دوارۆژ بووە."، کەواتە بەرژەوەندیی کردووەتە مەبەست لە هەموو بارێکدا[1].

(الشاطبي) لە دوو لایەنەوە چووەتە ناو سیستمی پەیوەندیی نێوان بێژەکانی(مفردات) مەبەستەکان و پلەبەندییان، **یەکەمیان:** لە لایەنی لقەوە، کە بریتییە لە بڕی هاوبەشی نێوان جۆرەکانی مەبەستەکان، کە مەبەستەکانە بەرەهایی، ئەمەش کاتێک دەزانین کە دەڵێت: "ئەمەش بە جۆرێك کە هیچ سیستمێك پێی تێك نەچێت لە کۆ و تاکیدا، جا چ لە زەرووریيەکاندا(الضرورات)، یاخود پێویستەکان(الحاجيات)، یاخود تەواوکارییەکان(التحسينات) بێت، چونکە ئەگەر بە شێوەیەك دانرا کە سیستمەکە تێك بچێت یان حوکمەکانی هەڵوەشێنێتەوە، ئەوە یاسادانانەکە ئەو مەبەستەی نەبووە[2]."

**دووەم:** لەو لایەنەوە کە مەبەست لەحوکمە شەرعییەکان، بەرژەوەندی و مەبەستی شەرعیی ڕەهایە[3]. وەك دەڵێت: "لەکاتێکدا بۆ خۆی بەرژەوەندی نییە، نابێتە ئەوەی لەپێشتر بێت لەوەی خراپەش بێت، بەڵکو یاسادانەر مەبەستیەتی بەرژەوەندی بێت بەرەهایی، بۆیە دەبێت دانانی بەو شێوەیە هەتاهەتایی و گشتگیر و گشتی بێت بۆ سەرجەم جۆرەکانی تەکلیف و مرۆڤەکان لە هەموو بارێکدا. بەم شێوەیەش لێی تێگەیشتووین، سوپاس بۆ خوا[4]."

---

[1] الشاطبي، إبراهيم بن موسى بن محمد اللخمي، الموافقات في أصول الشريعة، تحقيق: عبد الله دراز ـ محمد عبد الله دراز، ط الأولى، بيروت، دار الكتب العالمية، ١٤٢٥هـ ٢٠٠٤م ـ ص٢٣٨.

[2] الشاطبي، هەمان سەرچاوە.

[3] پاشتر هەر لەم بەشەدا لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان و مەبەستی شەرعی ڕەها باس دەکەین.

[4] الشاطبي، الموافقات، هەمان سەرچاوە.

پاشان (الشاطبي) دەست دەکات بە روونکردنەوەی تەواوکاری پەیوەندیی نێوان مەبەستە شەرعییەکان و مەبەستی شەرعیی رەها و دەڵێت: "باسی روونکردنەوەی ئەوە دێت کە ئەو سێ بابەتە گشتگیرن(کوللین) لە شەریعەدا، تێکڕا تایبەت(تەخصیص) ناکرێن گەر چی بێنە خوارەوە بۆ بەشەکییەکان(جوزئیات)، لەروویەکەوە گشتگیرن، گەرچی هەندێکی تایبەت کرابێت، ئەوەش لە دیدگایەکی گشتگیرەوەیە، هەروەها ئەگەر گشتگیر بوو، ئەوا بەشەکان دەچنە ناویەوە، چونکە دیدگای گشتگیر جێی بەشەکانیشی تیا دەبێتەوە و شۆڕبوونەوەی بۆ بەشەکان، لە گشتگیری کەم ناکاتەوە، ئەم بابەتەش ئەگەر سەلمێنرا ئەوا بەڵگەیە لەسەر تەواوی سیستمی یاسادانان، تەواوی سیستمیش تیایدا رێگرە لەوەی دابڕێت لەوەی بۆی دانراوە، کە بریتییە لە بەرژەوەندییەکان[1]."

بەڵام (الغزالي) دەڵێت: "مەبەست دابەش دەبێت بۆ ئاینی و دنیایی، هەریەکەیان دابەش دەبێت بۆ بەدەستهێنان و هێشتنەوە، هەندێك جار بە بەدەستهێنان دەوترێت سوود و بە هێشتنەوەش دەوترێت دوورخستنەوەی زیان. واتە ئەوەی مەبەست لێی هێشتنەوەیە، ئەوە بڕینی زیانە، هێشتنەوەشی دوورخستنەوەی ئەو زیانەیە، چونکە چاودێریی مەبەستەکان سندوقێکە بۆ هێشتنەوە و دوورخستنەوەی پچڕان و بەدەستهێنان وەك سەرەتا. هەموو جۆرەکانی گونجاوەکان دەگەڕێتەوە بۆ چاودێریی مەبەستەکان. هەر شتێك دابڕا لە رەچاوکردنی بابەتێکی مەبەستدار، ئەوا گونجاو نییە و ئەوەش ئاماژە بوو بۆ رەچاوکردنی بابەتێکی مەبەستدار، ئەوە گونجاوە[2]."

---

[1] الشاطبي، هەمان سەرچاوە.

[2] الغزالي، محمد بن محمد بن محمد، شفاء الغليل في بيان الشبه والمخيل ومسالك التعليل، تحقيق: حمد الكبيسي، ط الأولى، بغداد، مطبعة الإرشاد، ١٣٩٠هـ ١٩٧١م، ص١٥٩.

لـە هاوچـەرخانیش، (محمـد الطـاهر بـن عاشـور) لـە كتـێبی (مەبەسـتەكانی شـەریعەتی ئیسـلامی)[1]دا پێناسـەی مەبەسـتەكانی كـردووە و دەڵێـت: "مەبەسـتە گشتییەكانی شەریعەت واتا و پەندە تێبینیكراوەكانی یاسادانەرە لـە سـەرجەم یـان زۆربـەی بارەكـانی یاسـادانان، بـە جۆرێـك تێبینیكردنـی تایبـەت نییـە بـەوەی لـە جۆرێكی تایبەتیی حوكمە شەرعییەكان بێت، بۆیە وەسفەكانی شەریعەت و ئامانجـە گشـتییەكانی و ئـەو مانایانـەی كـە شـەریعە بێئاگـا نییـە لـە تێبینیكردنـی، لەوبازنەیەدان. واتاگەلێك كە ڕەنگە لە سەرجەم حوكمەكاندا تێبینی نەكرێن، بەڵكو لە بەشێكی زۆریـدا تێبـینی دەكـرێن.[2]" ئەمـەش دیـارە لـە پێناسـەی زانایانـدا، كـە ڕێككەوتنێك هەیە لەسەر ئـەوەی كـە مەبەسـتەكان لـە بازنـەی ئـەو بەرژەوەنـدی و ئامانج و پەندانەدایە، كە یاسادانەر مەبەستی بـووە لـە دانـانی شـەریعەدا. ئەمـەش مەبەسـتە گشـتی و تایبەتـەكان دەگرێتـەوە[3]، لـە ڕووی دانانـەوە بـۆ مەبەسـتی یاسادانەر و مەبەستی مرۆڤ، لە ڕووی گشـتی و تایبەتیـەوە، بـۆ مەبەسـتی گشـتی و مەبەستی گشتگیر و مەبەسـتی تایبـەتی و مەبەسـتی بەشـی(جوزئی)ەوە. لـە ڕووی

---

[1] فارس العزاوي، مدخل الى علم المقاصد(٢/٥) ، http://www.alukaj.net/sharia.(6155)(01/01/2014). و ابن الخوجة، محمد الحبيب، بين علمي أصول الفقه والمقاصد، وزارة الأوقاف والشؤون الإسلامية، قطر، ١٤٢٥هـ ـ ٢٠٠٤م، ص١٢٠.

[2] ابن عاشور، محمد الطاهر، مقاصد الشريعة الإسلامية، تحقيق محمد طاهر الميساوي، ط الثانية، عمان، دار النفائس، ١٤٢١هـ ـ ٢٠٠١م، ص١٦٥.

[3] الكيلاني، عبد الرحمن ابراهيم، قواعد المقاصد عند الأمام الشاطبي، عرضا ودراسة وتحليلا، دمشق، دار الفكر، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ص٤٦، و المقاصد العامة للشريعة الإسلامية، مرجع السابق ص٧٩. و دراسة في فقه مقاصد الشريعة، د. يوسف القرضاوي، ص٢٠. و علم المقاصد الشريعة، مرجع سابق ص١٦ ـ ١٧. و الاجتهاد المقاصدي، ص٥٢، قواعد المقاصد عند الأمام الشاطبي، مرجع سابق ص٤٧. و فارس العزاوي، مدخل الى علم المقاصد، (١ ـ ٥)

htt://www.alukaj.net/sharia.(6155)(01/01/2014.)

رەچـاوكردنی پشـكی مـرۆڤ و رەچـاونەكردنی بـۆ مەبەسـتی رەسـەن و مەبەسـتی شـوێنكەوتوو، لـە رووی یـەكلایی و گومانـەوە بـۆ مەبەسـتی یـەكلایی و مەبەسـتی گومانـاوی و مەبەسـتی بـێ بنـەما، لـە رووی خواسـتە و گرنگییـەوە بـۆ زەرووری و پێویست(حاجیات) و تەواوكاری[1].

## دابەشكردنی گشتیی مەبەستە شەرعییەكان

لەم بەشەدا دابەشكردنی جۆراوجۆری مەبەستە شـەرعییەكان دەخەینـە روو، لـە گرنگترینیان: **دابەشكردنی راستەقینە و دابەشكردنی رەچاوكاری**

## دابەشكردنی راستەقینە:

هەرچی دابەشكردنی راستەقینەیە بریتییە لەو دابەشكردنەی بەڕوونی بەشەكانی دیارن: چ بەپێی عەقڵ و چ وەك خۆی، بەو واتایەی عەقڵ سنووری بـۆ هـەر بەشـێك داناوە بە شێوەیەك كە جیاوازە لە هەرشتێكی دەرەوەی خۆی، بەو تایبەتمەندییەی خۆی لە هەر شتێكی تر جیادەكرێتەوە و لەدەرەوەشدا یەك شت نییـە كـە راسـتییە ئاشكراكانی تێدا بێتە دی بە شێوازی جۆراوجۆر، وەك دابەشكردنی گۆشە بۆ: تیژ و وەستاو و كراوە، چونكە عەقڵ بۆ هەریەك لەم سێ بەشە راستییەكی دانـاوە جیـای دەكاتەوە لە دوو بەشەكەی دی و پێیشی دەردەكەوێت، ناكرێـت گۆشـەیەك هـەبێت تیژ و كراوە و وەستاو بێت، هەروەها ناكرێت ژمارەیەك یەكسان بێت بە ژمێـردراو و كەمتر لێی و زیاتر لێی، نموونەی تری لەم چەشنە[2]، هەروەها ژمارەكان بـڕدراوەن و راجیاییيان لەسەر نییە. بەڵام زانست و بابەتەكانی دی تیۆرین و ناكرێت سنوورێكی

---

[1] الشاطبي، سەرچاوەی پێشوو.

[2] عبد الحميد، محمد محي الدين، رسالة الأداب في علم آداب البحث والمناظرة، ط السابعة، المكتبة التجارية الكبرى، مصر، ١٣٧٨هـ ـ ١٩٥٨م، ص١٩.

یەکلاکراوەیان بۆ دابنرێت لە یەکدی، بەڵکو تێکەڵییەکی وا لە نێوانیادایە کەناکرێت جیا بکرێنەوە، گەرچی جیاکردنەوەیەکی کەمیش بێت.

نموونەی دابەشکردنی راستەقینە وەك دابەشکردنی بەشەکانی بیروباوەڕ بۆ یەکخواپەرستی و هاوبەشدانان بۆ خوا، بەشەکانی یەکخواپەرستی و هاوبەشدانان لای عەقڵ و بۆخۆشیان روونن، بە واتای عەقڵ چوارچێوەیەکی داناوە بۆیان، لەدەرەوەشدا شتێك نییە کە لە یەك کاتدا راستییە ناتەباکانی تێدا بێتە دی بە لەبەرچاوگرتنی جوداییش، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی جیاوازیی ئەزموون و تێگەیشتن و سەرچاوە. زانایان را جیان لە هەندێك کەیس و بابەتی یەکخواپەرستی و هاوبەشدانان، هەندێك جار وا گومان دەکرێت، هەندێك لە بابەتەکان دەچێتە ژێر هەردوو ناونیشانەکەوە.

## دابەشکردنی رەچاوکاری ( ئیعتیباری )

هەرچی دابەشکردنی رەچاوکارییشە، ئەوەیە کە بەشەکانی تەنها لە عەقڵدا جیاوازن، بەڵام دەکرێت لە خۆیدا شتێك هەبێت سەرجەم راستییەکانی بەشەکانی لە روانگەی جوداوە تێدا بێتە دی. ئەمیش وەك دابەشکردنی گشتیی شوێنەکان –کە رێگر نییە لە وێناکردنی بوونی هاوبەشی تیایدا، وەك مرۆڤ و جەستە و ئاژەڵ و هاوشێوەکانیان– بۆ رەگەز و جۆر و بەش و تایبەت و خستنەڕووی گشتی. بۆ هەریەکێك لەم بەشانە راستییەك هەیە کە بە هۆیەوە عەقڵ دەیناسێتەوە و جیای دەکاتەوە لەگەڵ جگە لە خۆی، بەڵام شتێك بوونی دەرەکی هەیە و لە روویەکەوە رەگەز(جنس)ە و لە روویەکەوە جۆر(نوع)ە و لە روویەکەوە بەش(فصل)ە و لە روویەکەوە تایبەتە(خاصة) و لە روویەکەوە عەرەزێکی گشتییە(عرض عام)[١].

---

[١] محی الدین عبد الحمید، سەرچاوەی پێشوو.

بەکورتی، دابەشکردنە ڕەچاوییەکانی مەبەستە شەرعییەکان زۆرن، بە ڕەچاوکردنی ئەو شێوازانەی زانایان دایدەنێن بۆ لێکۆڵینەوەی مەبەستەکان لە گۆشەنیگا جوداکانەوە، بۆ وێنە، ئەمانە چەند نموونەیەکن[1] هەموو گۆشەنیگاکان نین:

دابەشکردنی مەبەستەکان بەپێی دانان، چوار جۆرن: مەبەستی یاسادانەر لە دانانی شەریعە لە سەرەتادا، دانانی شەریعە بۆ تێگەیاندن، دانانی شەریعە بۆ مرۆڤ بەپێی لێکەوتەکەی، چوونە ژێر حوکمەکانی شەریعەتەوە بۆ مرۆڤ[2].

دابەشکردنی مەبەستەکانی بەپێی گشتی و تایبەتی بۆ: مەبەستی گشتی: کە دەبێت هەبێت بۆ بەرپابوونی سیستمی جیهان و لەباربوونی بە شێوازێك کە جۆری مرۆڤ بەدروستی نامێنێتەوە بێ بوونی ئەم. زانایان ئەمەیان کورت هەڵهێناوە لە پێنج دانەدا، کە پاراستنی (ئایین و گیان و عەقڵ و وەچە و سامان[3])ن.

مەبەستی بەشی (جوزئی): ئەوەیە کە یاسادانەر مەبەستیەتی لە هەموو حوکمێکی شەرعیدا[4] و ئەوەی تیایەتی لە هۆکار و دانایی و نهێنی و مەبەستە فەرعییە فیقهییەکان، دەچنە ژێر ئەم جۆرەوە کە لە کتێبە فیقهی و ڕێساییەکاندا

---

[1] دوکتۆر فارس الغزاوی بە چاکی و بە کورتی میتۆدی زانایانی لە دابەشکردن و پلەبەندی مەبەستە شەرعییەکاندا خستۆتە روو بە پێی پێویست و بە بێ دووبارەکردنەوە، ئێمەش ئەوەندەی پێویستمان بێت و گونجاوبێت بۆ روونکردنەوەی پێشەکی و دەروازەی ئەم لێکۆڵینەوەیە و مەبەستی، بۆ زانیاری پتر بڕوانە: فارس العزاوی، سەرچاوەی پێشوو.

[2] الشاطبي، الموافقات، سەرچاوەی پێشوو لا٢٠٠، الاجتهاد المقاصدي، سەرچاوەی پێشوو، ج ١، لا ٥٣. فارس العزاوي، مدخل الى علم المقاصد، سەرچاوەی پێشوو (١ ـ٥). بڕوانە: بين علمي أصول الفقه والمقاصد، سەرچاوەی پێشوو لا ١٣٧.

[3] ابن عاشور، مقاصد الشريعة الإسلامية، س.ث. لا ٤١.

[4] سەرچاوەی پێشوو. لا٤١

بڵاون و زانایانیش کتـێبی زۆریـان لەسـەر ئـەم بابەتـە دانـاوە سـەبارەت بـە لایەنـە جوانییەکانی (محاسن)شەریعەت[1].

مەبەستی گشتگیر: ئەو مەبەستانەیە کە تێبینی دەکرێت لە هەموو یـان زۆربـەی بابەتەکانی شـەریعە و بوارەکانیـدا، بـە جۆرێـك کـە تێبینیکردنـی تایبـەت نییـە بـە جـۆرێکی تایبـەتی حوکمـەکانی شـەریعە، بـەڵکو وەسـفەکانی شـەریعە و ئامانجـە گەورەکانی دەچنە ژێر ئەم ناونیشانەوە[2].

مەبەسـتی تایبـەت: مەبەسـتە بەشـییەکان (جوزئییـەکان) دەگرێتـەوە کـە پەیوەستن بە بەشێکی دیاریکراو یان چەند بەشێکی هاوڕەگـەز لـە شـەریعەت، وەك باسەکانی مامەڵەکان[3].

دابەشکردنی مەبەستەکان لە روانگەی بوونی پشکی موکەللەف و نـەبوونی، ئـەو مەبەسـتانەیە کـە مـرۆڤ هەیـەتی لـە سـەرجەم هەڵسـوکەوتەکانی، وەك بیروباوەڕ(اعتقـاد) و وتـە(قول) و کردار(عمـل)[4]. کـە ئـەمیش مەبەسـتە رەسەنەکان(أصلية) و مەبەستە شوێنکەوتووەکان (التابعة) دەگرێتەوە، بەم جۆرە:

مەبەستە رەسەنەکان(أصلية): ئەو مەبەستانەیە کە مرۆڤ پشـکی نییـە تیایانـدا، کـە پێـنج زەروورەتەکـە دەگرێتـەوە لـە هـەر ڕێبازێـك و بـە هۆیـەوە بەرژەوەندییـە گشـتییە رەهاکـانی پـێ بـەرپا دەکرێـت و دوو جـۆرە: تاکـە کەسـی(عـيني) و کیفایە(کفائي).

---

[1] بین علمي أصول الفقه ومقاصد الشريعة، ل١٤٣

[2] الاجتهاد المقاصدي، سەرچاوەی پێشوو ج ١ ـ ل٥٤.

[3] ابن عاشور، مقاصد الشريعة الإسلامية، س.ث. ل ٤١. الاجتهاد المقاصدي، سەرچـاوەی پێشـوو. ج ١ ـ ل٥٤.

[4] الاجتهـاد المقاصـدي، سەرچـاوەی پێشـوو. ج ١ ـ ل٥٣. و الشـاطبي، الموافقـات، سەرچـاوەی پێشوو.ل٣٠١.

تاكە كەسییەكان: ئەوە پێویستە لەسەر یەكە یەكـەی هـەر مرۆڤێـك بەتایبـەتی، وەك فەرمانپێكران بە پاراستنی ئایین و گیان و عەقڵ و وەچە و سامان[1].

مەبەستە شوێنكەوتووەكان(التابعة): ئەو مەبەسـتانەی رەچـاوی پشـكی مرۆڤـی تێدا كراوە، لەم رووەوە لێكەوتەكانی ئەو شتانە بەدی دەهێنێت كە لە مرۆڤدا هەیە وەك حەز و ئارەزوو و شتە موباحەكان و پڕكردنەوەی كەموكورتییەكان[2].

## دابەشكردنی مەبەستەكان لە رووی یەكلایی( قطعي ) و گومانی( ظني )ەوە:

مەبەستی یەكلایی: ئەوەیە كە زۆر هاتووە و چەند بارە بووەتەوە لە بەڵگـەكانی قورئـان و فـەرموودە، وەك: ئاسـانكاری كـە لـە ئایـەت و فـەرموودەدا زۆر هـاتووە، وەك: مەبەستی ئاسایش و پاراستنی ناموس و سـامان و چەسـپاندنی دادگـەری و هەنـدێ شـتی تـریش[3]. مەبەسـتی گومـانی: ئەوانـەن كـە پلـەیان لـەخوار مەبەسـتە یەكلاییەكانەوەیـە. بەدەستخستنیشـی ئاسـانە، لـە رێـی خوێندنەوەیـەكی كـەمی هەڵسـوكەوتەكانی شــەریعەوە، لەبــەر ئــەوەی ئــەو خوێندنەوەیــە زانیــاری دەدات سەبارەت بە زاراوەی یاسادانەر و ئەوەی كە شەریعە رەچاوی دەكات[4].

مەبەستی بێبنەما: ئەوەیە كە بە ئەندێشەدا دێت و وا دەزانێـت –بێبنـەما– كـە لەبارە و چاكە و سوودبەخشە، بەڵام لە راستیدا پێچەوانەی ئەوەیە و گومـانی تێـدا

---

[1] هەنـدێك لـە زانایـانی ئوصـول پێناسـەی (واجـبی كیفـائی)ان بـەو شـێوە كـردووە كـە: مەبەسـتی شەرعدانە ر(شـارع)كردنی كارەكەیـە بـەدەر لـە بكەرەكـەی، بـەو واتایـەی كـە واجبـە لەسـەر كـۆی موكەللەفەكان، بەڵام بە ئەنجامدانی لەلایەن هەندێك كەسەوە ئیدی واجبەكە جێبـەجێ دەبێـت، بڕوانـە: الوجیز فی أصول التشریع الآسلامی، د. محمد حسن هیتۆ لا ٦٣.

[2] الموافقات، سەرچاوەی پێشوو. لا ٣٠٦.

[3] بین علمي أصول الفقه والمقاصد، سەرچاوەی پێشوو. لا ١٤٤. الإجتهاد المقاصدی، سەرچاوەی پێشوو ج ١ ـ لا ٥٥. بۆ زانیاری پتر بڕوانە: مقاصد الشریعة الإسلامیة، ابن عاشور. س. پ. لا ١٣٨

[4] مقاصد الشریعة الإسلامیة، ابن عاشور. سەرچاوەی پێشوو لا ١٤٣

نییە ئەم جۆرە لە مەبەستەکان بەرپەرچ دەدرێتەوە و بێبنەمایە[1]. لە دیارترین نموونەکانی: گومانبردن بە مەبەستە خوازراوەکانی رێگەدان بە سووخۆری و جووتبوونی ناشەرعی و بێحیجابیی ئافرەت. دابەشکردنی مەبەستەکان لەرووی پێویستی و گرنگییەوە دابەش دەکرێن بۆ: مەبەستی زەرووری و پێویستی و تەحسینی، چونکە مەسڵەحەتەکان بەپێی رادەی پێویستبوونیان دابەش دەکرێن بۆ پلەی: زەرووری و خواستی(حاجيّ) و جوانکاری و کەمالییات[2].

بە هۆی ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەچێتە بازنەی ملکەچبوون و یەکخواپەرستیی بێخەوش، بۆیە هیچ یەکێك لەو دابەشکردنانەی پلەبەندیی مەبەستە شەرعییەکان لە جۆری دابەشکردنی رەچاوکاری نابێت، چونکە ئەگەرچی لە عەقڵدا جودا بن، بەڵام شتانێك هەن بۆخۆیان سەرجەم راستییەکانی بەشەکانی تیا دێتە دی بە شێوازی جۆراوجۆر، هەروەك روونی دەکەینەوە لەم لێکۆڵینەوەیەدا. زیادکردنەکانی پێشینان(سەلەف) بۆ دابەشکردنەکانی مەبەستەکان: ئەگەر سەیری زیادکردنە مەبەستییە کۆنەکان بکەین بۆ پێنج مەبەستە زانراوە زەروورییەکە، ئەوا دەبینین بەزۆری لەمانە دەرناچێت: هەندێك (ناموس یا ناموسەکان)ی زیاد کردووە بۆ مەبەستە گرنگەکان و بوونەتە شەش، وەك: (القرافي ـ ك ٦٨٤ك[3]) و (ابن السبكي ـ ك ٧٧١ ك[4]) و (الشوكاني ـ ك ١٢٥٠ك[5]).

---

[1] الاجتهاد المقاصدی، سەرچاوەی پێشوو ج ١ ـ لا٥٥

[2] الغزالي، المستصفى الى علم الأصول، ط الثالثة، بيروت، دار احياء التراث العربي، ١٤١٢هـ ـ ١٩٩٣م، ج٢ ـ ص ٤٨١.

[3] القرافي، شهاب الدين أحمد بن ادريس، شرح تنقيح الفصول، بيروت، دار الفكر، ١٩٧٣م، لا ٣٩١.

[4] ابن السبكي، تاج الدين عبد الوهاب بن علي، جمع الجوامع، بيروت، دار الكتب العلمية، ٢٠٠١م، لا ٩٢.

[5] الشوكاني، إرشاد الفحول، تحقيق: أبو مصعب محمد سعيد البدري، سەرچاوەی پێشوو لا ٣٦٦.

هەندێك لەبری (بنەچە یا بنەچەكان) و دەربڕینی (ناموس یا ناموسەكان) دەربڕینی (وەچە)ی بەكار هێناوە، وەك: (الرازی ـ ك ٦٠٦ ك[١]) و (البیضاوي ـ ك ٦٨٥ك[٢]) و (الإسنوي ـ ك ٧٧٢ك[٣]). هەندێك دیاریی كردووە بە پێنج و لەبری (وەچە)، دەربڕینی (بنەچە)ی بەكار هێناوە بە چەسپاندنی (ناموس) و لابردنی (ئایینەكان)، وەك: (القرافي[٤]) و (الآبي ـ ك ٨٢٧ك[٥]). ئەمە و ئەوەی پێش ئەمیش، سنووردارنەكردن و كۆنترۆڵنەكردنێكی زۆری تێدایە، تەنانەت لەسەر ئاستی دەربڕینیش.

هەندێك رەخنە دەگرن لە پرنسیپی (دیارینەكردن) لە بنەڕەتیدا و ئەمەش زیاد دەكات (پەرستشە دیار و پەنهانەكان و مافی بەندەكان بەسەر یەكدییەوە) و جگە لەمانەش، لەوانەی بەرژەوەندییە شەرعییەكان دەیانگرێتەوە، تا وای لێ هاتووە كە دیاری نەكرێن بە ژمارەیەكی دیاریكراو، وەك: (ئیبن تەیمییە ـ ك ٧٢٨ك[٦]).

---

[١] الرازي، فخرالدين محمد بن عمر بن الحسين، المحصول في علم أصول الفقه، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٨٨م، لا٣٢٠.

[٢] البيضاوي، ناصر الدين عبد الله بن عمر، منهاج الوصول الى علم الأصول، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٨٤م، لا ٥٩.

[٣] الاسنوي، جمال الدين أبو محمد عبد الرحيم بن الحسن، نهاية السول في شرح منهاج الوصول، القاهرة، عالم الكتب، ١٤٤٣، ج٤، لا٧٥ ـ ٨٢.

[٤] القرافي، الفروق، سەرچاوەی پێشوو ، ج٤ ـ لا ١١٥٥.

[٥] الآبي، صالح بن عبد السميع المالكي، اكمال المعلم شرح مسلم، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٩٤م، ج٦. لا١٢.

[٦] شيخ الاسلام أحمد بن عبد الحليم، مجموع الفتاوى، جمع وترتيب: عبد الرحمن بن محمد بن قاسم، ط الأولى، الرياض، دار عالم الكتب، ١٤١٢ه ـ ١٩٩١م، ج٣٢، لا٢٣٣ ـ ٢٣٤.

هەندێك بەرژەوەندییە شەرعییەكانیان دابەش كردووە بۆ پێنج بەش و پاراستنی پێنج بەرژەوەندییە زەرورییەكەی كردووەتە بەشێك لەو پێنجە، وەك: (ابن فرحون ـ ك٧٩٩ك[1]) و دواتر پێداچوونەوەی ئەم زیادكردنە مەبەستییانەش دێت:

زیادكردنی پاشین(الخلف) بۆ دابەشكردنی مەبەستەكان: پوختەی مەبەستە زیادكراوەكان لەلایەن زانایانی هاوچەرخەوە بۆ پێنج مەبەستەكە، لەمانە دەرناچێت: پاراستنی سروشتی مرۆڤ و لێبوردەیی و سیستم و یەكسانی و ئازادی و دادگەری و ڕێز و ماف و ئاسایش و یەكبوون و ڕەوشت و ئاشتی و هاریكاری و یەكترناسین و بابەتی تری هاوشێوەی ئەمانە لە بەها بەرز و ڕێزدارەكان.

(م. طه عبد الرحمن) هەندێك ڕەخنەی مەنهەجیی جۆراوجۆری هێناوە، چ گشتی و چ تایبەتی، لەسەر دابەشكردنی بەها شەرعییەكان و پلەبەندییان بە شێوەیەكی گشتی. لە نووسراوێك لەژێر ناونیشانی (پرۆژەی نوێی زانستی بۆ بابەتی مەبەستەكانی شەریعە)دا تێڕوانینەكانی دەخاتە ڕوو[2]، كە پێی وایە دابەشكردنی بەهاكان لای زانایانی زانستی بنەماكان(الأصول) بۆ سێ بەش و پلەبەندییان بۆ سێ پلەی: گرنگ و پێویست و تەواوكاری، گرفت دروست دەكات بۆ مەرجی ڕوونی لە مەرجەكانی دابەشكردن، بە جۆرێك ئەو بەهایانەی بەشی گرنگی لێ پێك دێت، وەك: ئایین و گیان و عەقڵ و وەچە و سامان، بەتەنها بۆ ئەم دابەشكردنە نییە، بەڵكو هاوبەشە لەگەڵ دوو بەشەكەی تردا كە پێویست و تەواوكارین[3]. كورتەی بۆچوونەكەی چوار شتن و دەیەوێت هەریەكەیان بەجیا بسەلمێنێت: **یەكەمیان:**

---

[1] بزا، عبد النور، المقاصد الضرورية، بين مبدأ الحصر ودعوى التغير، مجلة اسلامية المعرفة، السنة العاشرة، ع٤٠، ١٤٢٦ربيع ـ ٢٠٠٥م، ص١٠٥.

[2] عبد الرحمن طه، مشروع تجديد علمي لمبحث مقاصد الشريعة، مجلة المسلم المعاصر، عدد ١٠٣، ١٤٢٢ ـ٢٠٠٢، لا ٤٩ ـ٥٠.

[3] بزا، عبد النور، هەمان سەرچاوە: لا ١١١ ـ ١١٢.

زانســتی مەبەســتەکان زانســتێکی ڕەوشــتییە و بابەتەکــەی چــاککردنی مرۆڤــە. **دووەمیان:** زانستی مەبەستەکان پێك دێت لە سێ تیـۆرەی ڕەوشـتی، کـە تیـۆرەی (کـردار) و تیـۆرەی (نیـەت) و تیـۆرەی (بـەها)ن. سێهەمیان: هەنـدێك لـەم تیۆریـا مەبەستییانە لە هەندێك ڕوویانەوە پێویستییان بە ڕاستکردنەوە هەیـە. **چوارەمیان:** لایـەنی ڕەوشـتیی حوکمــە شــەرعییەکان دەکاتــە بنچـینەی لایەنـە فیقهییەکــەی، هەروەك لایەنە فیقهییەکەی سەلمێنەری لایەنە ڕەوشتییەکەیەتی[١].

هەنـدێکی تــر ڕێرەوێکـی جودایــان هەیــە بـۆ زیـادکردنی مەبەسـت بـۆ پێـنج مەبەستەکە، کە مەبەستەکانیان کەم کردووەتەوە بۆ تەنها سێ مەبەستی بنەڕەتی، لەبری ئەوەی بۆی زیاد بکـات. مامۆسـتا (العلـواني) خـاوەنی ئـەم ڕێڕەوەیـە لـەناو زانایانی هاوچەرخ، بنەمای داناوە بۆ (تیۆرەی مەبەستە شەرعییە باڵا

\ زاڵـەکان/نظریـة المقاصـد الشـرعیة العلیـا الحاکمـة) لـە کتـێبی (مەبەسـتەکانی شــەریعە/مقاصـد الشـریعة) و وای دانـاوە کـە گشـتگیرێکی ڕەهـای یـەکلابووەوەن، سەرچاوەکانیان کورت دێنن لـە خوێندنـەوەی تـەواوی ئایەتـە تۆکمـەکانی قورئـانی پیرۆز و فەرموودە صـەحیحەکانی پێغەمبـەر(دروودی خـوای بەسـەر) و ئـەوەی کـە عەقڵەکان قبوڵیان کردووە و دیاریی کردوون بە سێ مەبەستی بنەڕەتی، کە بـریتین لـە: یەکخواپەرسـتی، پاککردنـەوەی دەروون(التزکیـة)، ئاوەدانکردنـەوەی زەوی[٢]. وەسـفیان دەکـات بـە هاوبەشـە پەیامییـەکانی ژێـر بـاڵی چـەمکی (پەرسـتن)، بـە شێوەیەکی تەواو.

---

[١] عبد الرحمن طه، هەمان سەرچاوە: لا ٤١ ـ٦٢.

[٢] العلواني، طه جابر، مقاصد الشریعة، بیروت، دار الهادي، ٢٠٠١، لا ١٣٥. هەروەها بڕوانە هەمان نووسەر: وتاری (التوحید والتزکیه والعمران) گۆڤاری (قضایا اسلامیة معاصرة)ع ١٨، ٢٠٠٢م.

ئـەوەی کـە (ئـیبن تەیمییـە) زیـادی کـردووە لـە پاراسـتنی (پەرسـتنە دیـار و پەنهانەکان)، ئەوە لە گەورەترین مەبەست و ڕێساکانی شـەریعەیە کـە مرۆڤایـەتی چاك نابێت بێ بوونی ئەمانە، بەڵام ئەوەی تۆماری کردووە سـەبارەت بەمـە لەسـەر هەندێك زانایانی بنەماکان (أصول)، لە کۆتاییەکەیدا دەرناچێت لە پێـنج مەبەسـتە گرنگەکـە و ئـەوەی لەدەوریـەتی لـە مەبەسـتە پێویسـت و تەواوکارییـەکان، بـەڵام مەبەسـتەکانی پەرسـتنە دیـار و پەنهانـەکان لـە جـۆری ناسـینی خـوای گـەورە و فریشتەکانی و پێغەمبەرانی و بارەکانی دڵ و کردارەکانی، وەك خۆشەویستیی خـوا و ترس لێی، دڵسۆزیی دینداری بۆی و پشتپێبەستنی و داواکردنی سۆز و بـەزەیی و لێپاڕانەوەی و جگە لەمانەش کە لە واتاکـانی بەرژەوەنـدیی دنیـا و دواڕۆژن[1]، ئـەوە لـەو مەبەسـتە شـەرعییانەن کـە دەگەڕێنـەوە بـۆ پاراسـتنی ئـایین کـە بریتییـە لـە ملکەچبوون و باوەڕهێنان و چاکەکردن لە وێستگەی کۆتاییدا. هـەروەك (الشـاطبي) دەڵێـت: "پاراسـتنی ئـایین کـۆ دەبێتـەوە لـە سـێ واتـادا، بـریتیین لـە: ئیسـلام (الإسلام)، ئیمان (الإيمان)، ئیحسان (الإحسان)[2]."

## دابەشکردنێکی تایبەت بەم لێکۆڵینەوەیە بۆ مەبەشتە شەرعییەکان

لەم بەشەدا چەند ڕەچاوکردنێك بەکار دەهێنین بۆ یەکـەم جـارە بـەکار دێـن لـە دابەشـکردنی مەبەسـتەکان، یـاخود بـە شـێوەیەکی جیـا لـەوەی زانـراوە بـەکار دەهێنـرێن، لـەو لایەنـەوە کـە بـەکارهێنانێکی نـوێن بـۆ ڕەچـاوکردنانێکی کـۆن، بەسوودە لە ڕوونکردنەوەی شێوازی پەیوەندیی نێوان مەبەسـتە شـەرعییەکان یـان

---

[1] ابن تيمية، مجموع الفتاوى الكبرى، ج٣٢ ـ ل٢٣٤.

[2] الشاطبي، الموافقات، ج٤ ـ ل٢٣٤

له کۆکردنەوەی ڕەچاوکردنێکی جودای پەرت لەناو بابەتەکانی فیقهـ و بنەماکانی فیقه(أصول الفقه).

## دابەشکردنی مەبەستەکان لەبەر ڕۆشناییی پلەبەندیی نێوانیان

مەبەست لە پلەبەندی:

مەبەست لە (پلەبەندی) ئەو سیستەمە جێگیرەی مەبەستەکانە کە (الشاطبي) باسی کردووە و پێویستی دەکات بەشەکان ببەسترێنەوە پێکەوە و پلەبەندی بکرێن. (الشاطبي) دەڵێت: "ئەوە بە شێوەیەك کە سیستەمی پێ تێك نەچێت، نە بەپێی گشت و نە بەپێی بەش، جا چ لە بابەتی زەروورییەکان بێت یان پێویستەکان یان تەواوکارییەکان، چونکە ئەگەر بە شێوەیەك بێت کە سیستەم تێك بدات یان حوکمەکانی هەڵبوەشێتەوە، ئەوە بە یاسای ئەو دانانرێت[1]."

چونکە پلەبەندی بەپێی ئامانج و مەنهەجی ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتییە لە سیستەمی پەیوەندییە پلەبەندییەکانی نێوان سەرجەم جۆر و پلەکانی مەبەستە شەرعییەکان.

لێکۆڵینەوەی پلەبەندییەکان، درکە(کینایە)یە لەبری زاراوەی (دەروازە سیستەمیەکان ـــ System Approach)ە لە لێکۆڵینەوەی سیستەمە سروشتییەکان یان ئەوانەی مرۆڤ دروستی کردوون، ئەویش مەنهەجێکی بیرکردنەوەیە چڕ دەبێتەوە لە وردبوونەوە لە پەیوەندی و سروشتی کارلێکی توخمە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی سیستەمەکە.

سیستەم یەکەی تەنها بەشێك لە بەشەکانی لێکۆڵینەوە و شیکاری نییە، بەڵکو یەکەی بنەڕەتییە. وەسف دەکرێت بەوەی تێکەڵەیەکە لە کۆمەڵێك بابەت کە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٢٣٨.

كاريان هەيە و پەيوەندييەكی ڕێكوپێكيان لەنێوانداية و بـە هـەموويان چـالاكييەكی ئامانجدار ئەنجام دەدەن و چەند خەسڵەتێكی جياكەرەوەيان هەيە لەگەڵ جگـە لـە خۆيان و ئەم سيستمە كارتێكەر و كارتێكراوە لەگەڵ دەوروبەرەكەيدا[١].

بەم پێيە، دەروازەی سيستمی بۆ لێكۆڵينەوە لە مەبەستە شـەرعييەكان ئەوەيـە كە دەڕوانێتە مەبەستەكان لەو لايەنەوە كە كۆمەڵێك بەش و يەكەن بـۆ يـەك شـت و دياری دەكرێن و كارلێك دەكەن لەناو خۆياندا بۆ بـەديهێنانی ئامـانجێكی ديـاريكراو لە ناوچەيەكی دياريكراو، چونكە مەبەستە شەرعييەكان بە جۆر و بەشەكانيەوە لێی دەكۆڵرێتەوە وەك يەك سيستمی پەيوەست لـەناو خۆيـدا و هەريـەكێكيان خزمـەتی ئەوی تر دەكات، كـار دەكەنـە سـەر يـەكتر و كاريـان تـێ دەكرێت لەلايـەن ئـەوانی ترەوە بە ڕێگەی ڕاستەوخۆ يان ناڕاستەوخۆ.

---

[1] -13December 30 approach> 20%sestems 20%http://faculty.mu.edu.sa/iazuaiber/APM 3:16.
- Bbarson, J@Heinich,R.The sestem approach to instruction, davi 1966Convention, San Deigo(audiotape).Boulder: National Tape Rrepository, University of Colorado. Also reported in the system , Auiovisual instruction. 1966> 11. 431 - 433.
- Bern,H. A. Wanted: Educational engineers Phi Delta Kappan, 1967, 48, 230 – 236.
- Corigan, R, E, Kaufman, R. A. Why System engineering. Palo Alto, Calif. Fiaron 1966.
- Eldridge, Maxims for a modern man. Carnbury, N,j, : A. S. Barnes. 1965.
- Kaufman, R, A, Corrigan, R.E. Corrigan. B. O. & Goodwin, D,L. Steps and Tools of system analysis in education, functional analyses in education, Task analyses in education, Methods- means analyses in education, An interim generic probles solving model, An exercise in the analyses of planned change in education, (Eight pamphlets prepared for operation PEP)San mateo Clif.: San Mateo County Department of Education, 11967.
- Mauch, J A systems analyses approach to education, Phi Delta Kappan.1962, 43, 158 – 1161.
Silvern, L, C, Cybernetics and education, K-12 Audiovisual, 1968, 13, 267 0175.

خەسڵەتەکانی سیستمەکە(پلەبەندی) ئەوەیە کە: پێك دێت لە چەند بەشێکی پێشتر زانراو بە مەرجی کارلێك یان تەواوکاری یان یەکێتی یان پەیوەندیی هاوبەش، سیستمەکە ئامانجێکی دیاریکراوی هەبێت کە سەرجەم پێکهاتەکانی هەوڵ بدەن بۆ بەدیهێنانی و بپێورێت و ئەندازەگیری بکرێت و پێك بێت لە کۆمەڵێك توخم و سیستمی باڵا (super system) و لقەسیستم (sub system)، کە هەر سیستمێکی بەشێك بێت لە سیستمێکی باڵاتر، یاخود بنەڕەت یان هاوشان بێت بۆ سیستمێکی دیکە.

خاوەنی پەرتووکە شیعریی (مرتقى الوصول) دەڵێت:

"هەر کردارێك مرۆڤەکان ئەنجامی ئەدەن، یان وەسیلەیە یان مەبەستە، یەکێك لە پێنج ئەحکامەکەش بەسەریدا جێ بەجێ دەبێت، بەشێوەیەك کە ئەگەر مەبەستێکی تێدا نەبێت، ئەوا ئیعتیباری نابێت وەك مەبەست، بەڵام دەکرێت ببێتە وەسیلەیەك بۆ شتێکی تری سەرووی خۆی. ڕەنگە هەندێ جاریش هاوکات ببێتە وەسیلە و مەبەست"[١]. بەم پێیە، دابەشکردنی مەبەستەکان بە پلەبەندیی نێوانیان بەپێی جۆر و شێوەیان بەم جۆرەن:

جۆری یەکەم: ئاستی پەیوەندیی ناوخۆیی لەنێوان خودی مەبەستە شەرعییەکان، ئەمیش لە دوو لقەئاستدا دێت:

**یەکەم:** سیستمی پەیوەندیی لەنێوان بێژەکانی ڕەهایی مەبەستە شەرعییەکان.

**دووەم:** سیستمی پەیوەندیی لەنێوان مەبەستە شەرعییەکان و ویستراو(مەبەست)ی مەبەستەکان.

---

[١] مخدوم، قواعد الوسائل. ل٩٢. بە وەرگرتن لە: أبو بکر بن عاصم الاندلسی کە پەرتووکی (الموافقات)ی کردووە بە شیعر بە ناوی: نیل المنی، لە پەرتووکە شیعریی: مرتقى الوصول. بڕوانە: ابن بابە، محمد فال، شرح المرتقى، دەستنووسی ٧٦/١٠.

جۆری دووەم: ئاستی پەیوەندیی دەرەکی لەنێوان مەبەستە شەرعییەکان و دەوروبەریان، ئەمیش گۆڕاوەکانی شوێن و کات و بار و مرۆڤ دەگرێتەوە[١].

پلەبەندیی سیستمی مەبەستەکان بۆ دوو جۆر:

**یەکەم:** سیستمی کراوە، دەناسرێتەوە بە کارتێکردن و کارتێکران بە دەوروبەری.

**دووەم:** سیستمی داخراو، دەناسرێتەوە بە کارتێنەکردن و کارتێنەکران بە دەوروبەری.

## پلەبەندیی هۆکارەکانی مەبەستەکان

**یەکەم:** هۆکارە سەربەخۆکان: کە کاریگەریی راستەوخۆی هەیە لە ڕوودانی هۆکارە شوێنکەوتەکان و سوودبەخشە لە ئەندازەگیری و شرۆڤە و تێگەیشتنی بابەتی گۆڕاو، لە روانین بۆ داهاتوو و کاریگەرییان.

دووەم: هۆکارە شوێنکەوتووەکان –دووەمییەکان–: ئەو شتانەیە کە جێی شرۆڤە و لێکۆڵینەوەن بۆ زانینی هۆکار و ئاماژەکانی روودانیان و رادەی توانینی پێشبینیکردنیان پێش روودانیان.

**سێیەم:** هۆکارە ناوەندییەکان: ئەو شتانەیە کە بە هۆیانەوە کاریگەریی هۆکارە سەربەخۆکان بۆ لێوەی تێ دەپەڕێت بۆ هۆکارە شوێنکەوتووەکان[٢].

---

[1] See: Open System Closed System. Isolated. Systemhhttp://en. Wikipedia.org./wiki/open –system- 28% systems-thiory29%
http://en.wikipedia.org/wiki/Closed-system.
http://en.wikipedia.org/wiki/Isolated-system.

[٢] مەبەست لە گۆڕاوە سەربەخۆکان بریتییە لە. Independet Variables

وە مەبەست لە گۆڕاوە شوێنکەوتەکانیش بریتییە لە: Dependent Variables

## دابەشکردنی مەبەستەکان بە پێی گرنگییان

بەپێی گرنگییان مەبەستەکان دابەش دەکرێن بۆ چەند ئیعتبارێك، بۆ نموونە: گرنگیی مەبەستە شەرعییەکە بە بەراورد بە گرنگیی مەبەستێکی شەرعی دیکە و گرنگیی مەبەستە شەرعییەکە بۆ مسوڵمان، پاشان گرنگیی کرداری مرۆڤ بەگوێرەی مەبەستە شەرعییەکە.

هەرچی زەروورەتی مەبەستێکی شەرعییە بە بەراورد بە مەبەستێکی شەرعی دیکە، ئەمە خولگەی داخوازییەکانی پێداچوونەوەیە بە کورتهەڵهێنانی مەبەستە زەرووریيەکان لە پێنج مەبەستە بەناوبەگەکە. گرفتیش لەوەدا نییە کە ئەم مەبەستەیان شەرعییە یاخود ئەویان، بەڵکو گرفت ئەوەیە: ئایا ئەم مەبەستە یاخود ئەویان مەبەستێکی شەرعیی زەرووریيە یان نا[1]؟ ئەم گرفتەش سەرچاوەی کورتهەڵهێنانی مەبەستە زەرووریيەکانە لە پێنج دانەدا، ئەوانیش: پاراستنی ئایین و نەفس و عەقڵ و وەچە و سامانن، هەروەها لەوەدایە کە تەنها ئەم پێنجە گرنگن و جگە لەمان یا پێویستن یاخود تەواوکارین.

سوودی ئەم ئیعتیبارەش لە جیاکردنەوەی مەبەستە شەرعییە گرنگ و پێویست و تەواوکارییەکاندایە، لە کاتی پێویستدا بۆ پێشینەدان(ترجیح) بە مەبەستەکان، بە جۆرێك مەبەستی زەرووری پێش دەخرێت بەسەر مەبەستی پێویست و تەواوکاری و مەبەستی پێویست پێش دەخرێت بەسەر تەواوکاری، لە بەدواداچوونیشدا ئەمە

---

مەبەستیش لە نێوەندەکانیش بریتییە لە: Intermidiate Variables

فاکتەری هەموو ئەمانەش دروستبوونی ناوەکیی پەیوەندی نێوان مەبەستەکانن، لەئەنجامیشدا دروستبوونی سیستەم.

[1] بزا عبد النور، هەمان سەرچاوە. ل٧٧.

پێشـینەدان نییــە لــەنێوان مەبەسـتەکاندا، بــەڵکو پێشـینەدانە لــەنێوان پلــەی بەرژەوەندییەکان کە مەبەستە شەرعییەکان هەڵیاندەگرن و لەخۆیان دەگرن.

بەڵام بە روانین لە مەبەستە شەرعییەکان لە روانگەی تەکلیفبوونـەوە، مەبەسـتە شەرعییەکان بـە جیـاوازیی گرنگییـان و جیـاوازیی حـوکمی وازهێنـان لـە یـەکێکیان بەڵام بەتەواوی نا، بەڵام مەبەسـتەکانی هاوبەشـن لـەوەدا کـە هـەموویان داواکـراون کـردار بـە داخوازییـەکانیان بکرێـت، بۆیـە دروسـت نییـە وازهێنـان لـە یـەکێکیان بەتــەواوی، بــەم پێیــە هــەموو مەبەســتە شــەرعییەکان گــرنگن بەگشــتی و بــەوەی وازهێنـان لـە هەریـەکێکیان وازهێنانـە لـە تـەکلیفێك کـە دروسـت نییـە وازلێهێنـانی بەتەواوی.

بەڵام گرنگترینی ئەم دابەشکردنانەی پەیوەسـتن بـە کـرداری مرۆڤـەوە، ئـەویش گرنگیی کرداری مرۆڤە بەپێی مەبەستە شەرعییەکە. لەناو کردارەکانی مرۆڤدا هەیـە زەروورە بــۆ بــەدیهێنانی مەبەســتە شــەرعییەکە و هەیانــە پێویســتە و هەشــیانە تەواوکارییە بۆ بەدیهێنانی مەبەستە شەرعییەکە.

بۆیە دەبێت پێوەرێك هەبێت لەبار بێت بۆ پێوانی سەرجەم جۆرەکانی مەبەسـتە شەرعییەکان لەو رووەوە کە گرنگن، یاخود پێویسـتن، یـاخود تـەواوکاری، ئـەویش بەم جۆرەیە:

**- هەر شتێك پەکی بکەوێت لەسەر شتێکی دی، شتی دووەم دەبێتە زەروور بۆی:**

- هەر مەبەستێك بەدی نەیەت مەگەر بە بـوونی مەبەسـتێکی شـەرعی دیکـە، ئەوە ئەوەیان گرنگە بۆ مەبەستەکە.
- هــەر مەبەسـتێك نەیەتــە دی مەگــەر بــە بـوونی کـارێکی دیـاریکراو لەلایـەن مرۆڤەوە، ئەوە ئەو کارە زەروورە بۆ ئەو مەبەستە.

**- هەر شتێك ببێتە هۆی ئاسانكاری بۆ شتێكی دی، ئەوە ئەو شتە پێویستە بۆ شتەكەی سەرەتا:**

- هەر مەبەستێك ئاسانكاری بكات بۆ بەدیهێنانی مەبەستێكی شەرعیی دیكە، ئەوە ئەو مەبەستەی یەكەم پێویستە بۆ مەبەستی دووەم.
- هەر مەبەستێك پێویستی بە كارێك بێت بۆ بەدیهێنانی لەلایەن مرۆڤەوە، ئەوە ئەو كارە پێویستە بۆ ئەو مەبەستە.

**- هەر شتێك باشتر بێت بۆ شتێكی دیكە، ئەوە شتی یەكەم تەواوكارییە بۆ دووەم:**

- هەر مەبەستێك باشتر بێت بۆ بەدیهێنانی مەبەستێكی شەرعیی دیكە، ئەوە مەبەستی یەكەم تەواوكارییە بۆ مەبەستی دووەم.
- هەر مەبەستێك باشتر بێتە دی بە ئەنجامدانی كارێك لەلایەن مرۆڤەوە، ئەوە ئەو كارە تەواوكارییە بۆ ئەو مەبەستە[١].

**دابەشكردنی مەبەستەكان بۆ مەبەست (لە) شتێك و مەبەست (لەناو) شتێك:**

سەرجەم مەبەستە شەرعییەكان لەسەر دووانەییەك وەستاون كە یەكتر تەواو دەكەن، بۆ وێنە: هەر مەبەستێك لایەنێكی هەیە پەیوەستە بە تاكەوە و لایەنێكی پەیوەست بە كۆمەڵەوە و ئەمەش دووانەن، لایەنێكی پەیوەست بە دڵەوە و لایەنێكی پەیوەست بە كرداری ئەندامەكان، ئەمەش دووانەیەكی دیكەن و هەر مەبەستێك لایەنێكی ئەنجامدانی رووكاریی هەیە و لایەنێكی بابەتیی جەوهەریی هەیە، ئەمەش دیسان دووانەیە، سەرجەم ئەم دووانەییانە یەكتر پتەو و تەواو دەكەن بۆ بەدیهێنانی شتێكی مەبەست لە شەرعدا.

---

[١] بۆ زانیاری پتر بڕوانە: آل سعود، عبد العزیز بن سطام، اتخاذ القرار بالمصلحة، الریاض، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامیة، ١٤٢٦هـ - ٢٠٠٥م. ج١ - ص٢١٠ -٢١٣.

گرفت هەیە لە گرانیی دابەشکردنێکی ئاشکرا، سەرجەم لایەنە جەوهەری و رووکەشییەکان کۆ بکاتەوە لە یەك بابەتدا بۆ هەر مەبەستێکی شەرعی، جا چ بەشی و تایبەت بێت یا گشتی و گشتگیر، بۆیە بەکارهێنانی دەربڕینی (لە شتێك) و (لەناو شتێك) دێتە پێش، بۆ جیاکردنەوەی مەبەست لە شتێك و مەبەست لەناو شتێك، بە شێوەیەك رێگە بدات بە دەربڕین سەبارەت بە دوو لایەنی جەوهەری و رووکەشی لە یەك بابەتدا بۆ هەر مەبەستێکی شەرعی.

مەبەست لە وتەی (لەناو شتێك): ئاوەڵکاری شوێنیی (لەناو) حاڵەتییە و ئەوەش بنەڕەتییە تیایدا، رەنگە بۆ چەند واتایەکی دیکە بەکار بێت و زانایانی (النحو) بە تێروتەسەلی لەسەری دواون لە کتێبەکانی تایبەت بە واتای پیتەکان[1]، بۆیە واتای ویستراو لە ئامڕازی (لە) لە رستەی: "مقصد الله عز و جل فى الخلق و فى التشريع." حاڵەتییە و بەم پێیەش واتای دەربڕینی (مەبەستی بەدیهێنەر لە بەدیهێنان) بریتییە: لەوەی ویستراوە بەدی بهێنرێت لە هەر تاکێك لەوان. مەبەست لە دەربڕینی (مەبەستی یاسادانەر لە یاسادانان) بریتییە: لەوەی ویستراوە بەدی بهێنرێت لە یاسادانان بۆ هەر تاکێکیان.

مەبەست لە (لەناو): واتای مەبەست لە ئامڕازی (من) لە دەربڕینی "مقصد الله عز و جل من الخلق و من التشريع." بریتییە: لەوەی کە (من) بۆ ئامانجە، وەك:(أخذته من الصندوق)، بردم لەناو سندوقەکە[2]...

---

[1] ابن ام قاسم المرادي الجني، الداني في حروف المعاني، تحقيق: فخر الدين قباوة، ومحمد نديم فاضل، ط الأولى، ١٤١٣هـ ١٩٩٢م، بيروت، دار الكتب العلمية للنشر والتوزيع، ص ٧٧ ـ٧٨. و: ابن هشام أبو محمد عبد الله الانصاري، ت٧٩١هـ، مغني اللبيب عن كتب الأعاريب، تحقيق: محمد محي الدين عبد الحميد، ط الأولى، بيروت، المكتبة العصرية، ١٤١١ه ـ ١٩٩١م. ص١١١.

[2] تێبینی ئەوە بکە لەبری اخذت، اخذته بەکارهێنراوە، کە ئاوەڵناوەێك (ضمير)زیاد کراوە، دەبێتە مفعول به، (من) و(ما) بۆ روونکردنەوە (بيان)زیادکراوەن، پێویستە بۆ سەرەتا و ئامانجی مەبەست بێت،

پیتی (من) له زۆربـەی شـوێنەکاندا بـۆ دیـاریکردنی سـەرەتای مەبەسـتە، بـەڵام هەندێك جاریش هاوکات بۆ دیاریکردنی سەرەتا و کۆتاییش مەبەست بەکار دێت[1].

بەرهەمی ئەم جیاوازیکردنـە لەوەدایـە کـە مەبەسـت لـە شـتێك بـە بـەکارهێنانی ئـامرازی (مـن)، ئـەوە بـۆ بـەدیهاتنی ئامانجـە شـەرعییەکەیە لێـی و دەرئـەنجامی خواستراو لێی. مەبەست لە شتێك بە بەکارهێنانی ئامرازی (في)، ئەوە بۆ بـەدیهاتنی دروسـتییەتی بـۆ هـەر مرۆڤێـك، چـونکە یاسـادانان وەك کیسـەیەك هـەمووی لـەخۆ دەگرێت و ریزپەڕ(شاذ)ی تیّ ناکەوێت، لێرەوەیە رۆچوون دێتە ئاراوە بۆ گشتی، لە واتای (في) و لەو تێکستەی بەڵگەیە بۆی.

## دابەشکردنی مەبەستەکان بۆ رەهاییی مەبەستەکان و مەبەستی رەها

(القرافي) لە جیاوازیی پازدەیەمدا باسی جیاوازی لەنێوان رێسای فەرمانی رەهـا و رێسای رەهاییی فەرمان و گشت ئەم جـۆرە هاوتایانـەی لـەم شـێوازەن دەکـات ، چونکە دوو رێساکە جیا دەبنەوە لە هەموو ئەم هاوتایانەدا کاتێـك دەوترێـت: البیـع المطلق، ئەلف و لامی سـەر وشـەی بەیعـەوە هـەموو جۆرەکـانی بـەیع دەگرێتـەوە، لەگەڵ وشەی (مطلق) یشدا تایبەتبوونی بەهۆی مەرج یان سـیفەتێکەوە تێـدا نییـە، بەڵام ئەگەر بڵێین: مطلق البیع، ئەوا ئەندازەی هاوبەشـی نێـوان هـەموو جۆرەکـانی بەیعمان مەبەستە و جگە لە بەیع شـتێکی ترمـان مەبەسـت نییـە و هـەر جۆرێـك لـە جۆرەکانی دەگرێتەوە[2].

---

بە پێچەوانەی ئەوەی کە ئاوەڵناوی لەگـەڵ نـەبێت، کـە ئەگـەری هەیـە تـەواوکاری رسـتەکە بێـت و بـۆ بەشێك بێت (للتبعیض).

[1] ابن هشام الانصاري، مغني اللبيب، ص٢١٣. و ابن جني، الداني في حروف المعاني، ص ٩٧.

[2] القرافي: الفروق، أو انوار البروق فى انواو الفروق، ضبطه وصححه، خليل المنصـور، ط الأولى، بـيروت، دار الكتب العلمية، ١٤١٨هـ ـ ١٩٩٨م، الفرق الخامس عشر، الفرق بين قاعدة الامـر المطلـق و مطلـق الامـر، ج١

بەرهەمی ئـەم جیاوازیکردنـە لەوەدایـە، جیـاوازی لـەنێوان (مەبەسـتی شـەرعیی رەها) بکەین لەوەی گشتگیرە و سنووردار نییە بە سنووریکی تایبەتکەر لە مـەرج و سیفەت و جگە لەمانیش لە پاشگری گشتگیر، کە دەبێت تایبەتکردنێکی تەواو بێـت بۆ گشت تاکەکانی مەبەستەکان و هیچ مەبەستێك نەمێنێت نەچێتە ناوی.

لەنێوان (رەهای مەبەستی شـەرعی) لـەوەی بریتییـە لـە ئەندازەیـەکی هاوبـەش لەنێوان سەرجەم جۆرەکانی مەبەستەکان کـە پێـی بوترێت مەبەسـت و راسـتە بـۆ تاکێـك لـە مەبەسـتەکان و وشـەی (رەهـای) یـان کـردووە بـە ئامـاژە بـۆ ئەنـدازەی هاوبەشی تایبەت کە دروستە بۆ تەنها تاکێك.

ئەمەش روون دەکەینەوە لە بەشی داهاتوو، پشتیوان بە خودای گەورە.

---

ص١٢٨. حاشية ابن الشاط على الفروق للقـرافي، ص١٢٨. حاشـية ابـن الحسـين المكـي المـالكي، ضـمن حاسية ابن الشاط على القرافي ص١٤٠.

# بەشی دووەم
# ڕەهایی مەبەستە شەرعییەکان

ڕوانین لە ڕەهایی مەبەستە شەرعییەکان بە پلەی یەکەم، ڕوانینە بۆ جۆرایەتی و چەندایەتیی مەبەستە شەرعییەکان بە مەبەستی یەکەم. پاشان بە پلەی دووەم، ڕوانینە بۆ هۆکاری هاوبەشی نێوان سەرجەم مەبەستەکان، ئەویش بەرژەوەندییە بە مەبەستی دووەم.

ئەگەر وتمان: ڕەهای مەبەستی شەرعی: ئەوە ئاماژەمان داوە بە (ڕەها) بۆ ئەندازەی هاوبەشی نێوان سەرجەم جۆرەکانی مەبەستەکان و ئەویش ئەو مەبەستانەیە کە دروستە بۆ تاکێك لە تاکەکانی، پاشان ئەم ڕەهایەی ئاماژەی بۆ کرا، دراوەتە پاڵ شەرعیەت بۆ جیاکردنەوەی لە ڕەهای مەبەستەکانی مرۆڤ و ڕەهای فەرمانەکان و ڕەهای جگە لەمانیش و ڕەهای سەرجەم ڕاستییەکان، بۆیە دامانە پاڵی، تەنها بۆ جیاکردنەوە و ئەویش هاوبەشی تایبەتە کە دروستە بۆ تاکێك لە تاکەکانی مەبەستەکان و بەمەش جیاوازییەکە دەرکەوت لەنێوان مەبەستی ڕەها و ڕەهای مەبەستەکان[١].

---

[١] القرافي، انواء البروق في انواع الفروق، ج١ ص١٢٨. حاشية ابن الشاط على الفروق للقرافي،ص١٢٨. حاشية ابن حسين المكي المالكي ص١٤٠.

بـەم پێیـە ڕەهـای مەبەسـتی شـەرعی بریتییـە لـە (ڕەهـای بەرژەوەندییـە ڕێپێـدراوەکان). هـەر بەرژەوەندییـەکی ڕێپێـدراو بـە هـەر ئەندازەیـەك، بریتییـە لـە بەشی هاوبەشی نێوان سەرجەم مەبەستە شـەرعییەکان و خـاڵی نییـە لـە هیچیان. بەمـەش مەبەسـتە شـەرعییەکان جیـا دەبنـەوە لـە مەبەسـتەکانی دیکـە و دیسـان بەمـەش مەبەسـتێکی شـەرعی جیـا دەبێتـەوە لـە مەبەسـتە شـەرعییەکانی دیکـە، لەمەشـەوەیە دابەشـکردنی مەبەسـتەکان بـۆ مەبەسـتی تایبـەت بـە بـەدیهێنانی بەدیهێنراوەکان و مەبەستی تایبەت بە دانانی یاسا.

## مەبەستەکانی بەدیهێنانی بەدیهێنراوەکان

مەبەسـتەکانی بـەدیهێنانی بـەدیهێنراوەکان دابـەش دەبـن بـۆ دوو بـەش: مەبەسـتەکانی بەدیهێنـەر لـە بـەدیهێنانی بـەدیهێنراوەکان، ئـەویش: ئەوەیـە کـە ویسـتراوە لـە بـەدیهێنانی بـەدیهێنراوەکان لـە سـەرەتا و کۆتـایی و مەبەسـتەکانی بەدیهێنەر لە بەدیهێنانی بەدیهێنراوەکان، ئەویش: ئەوەیە کە ویستراوە بـەدی بێـت لە هەر تاکێك لێیان –لە بەدیهێنراوەکان–.

## مەبەستی بەدیهێنەر لە بەدیهێنانی بەدیهێنراوەکان -بە واتای یەکەم-:

مەبەسـتی بەدیهێنـەر لـە بـەدیهێنانی بـەدیهێنراوەکان  بریتییـە لـە: (پـەرسـتن)، ئەویش هەموو ئـەو شـتانەیە کـە خـوا خۆشـی دەوێـن لـە وتـە و کـرداری ئاشـکرا و پەنهان. (ئیبن تـەیمییە) دەڵێت: "پـەرستن: ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەوانـەی خوا خۆشی دەوێن و قایلە پێیـان لـە وتـە و کـرداری ئاشـکرا و پـەنهان." هـەروەها دەڵێـت: "پەرسـتنی خـوداش ئامـانجێکی خۆشەویسـتە لای ئـەو، قایلـە پێـی و

بەدیهێنراوەکانیشی بۆ دروست کردووە[1]." بۆیە ئەو کردارانەش خوا خۆشـی دەوێـن و پێیـان قایلــە، ئەوانــە مەبەســتی بەدیهێنــەرە کــە ویســتراوە لــە بــەدیهێنانی بەدیهێنراوەکان لە سـەرەتا و کۆتاییـدا، دەویسـترێت لـە بـەدیهێنراوەکان سـەرجەم کردارەکانیان بێ هەڵاوێرد لەوانە بێت کە خوا خۆشی دەوێن و قایلە پێیان، ئەمەش دوو دەرئەنجامی هەیە: یەکـەم: جێبەجێنـەکردنی پەرسـتن وەك خـوو، دووەم: کـە دەرئـەنجامی خـاڵی یەکەمـە، لـە گـۆڕینی هـەموو خوویـەك بـۆ پەرسـتن. چـونکە مەبەسـتی خـودای گـەورە لـە بـەدیهێنانی بـەدیهێنراوەکان، بریتییـە لـە پەرسـتنی (خودا). پاداشتی جێبەجێکردنی ئەم مەبەستەش –واتە پەرستنی خودا–، بریتییـە لە بەدەستهێنانی بەخشش و قایلبوونی و دووربوون لـە سـزای. پەرسـتنیش لەسـەر دوو بنەمای گەورە دەوستێت: جگـە لـە خـودا نەپەرسـترێت و خـوداش بـەو شـێوە بپەرسترێت کە خۆی داینـاوە.

خودا دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾﴾ [سورة الذاريات:٥٦] فەرمایشــتی: "إلا لیعبــدون"، لــە زمــانی عەرەبیــدا پێــی دەوترێــت هــەڵاواردنی موفەڕڕەغ(الإستثناء المفرغ) کە لە گشتگیرترین جۆرەکـانی هەڵاواردنـە، واتـە: "نـە مرۆڤ و نە پەریم بۆ هیچ شتێکی تر دروست نەکردووە، جگە لە پەرستن." پـیتی لام لـە فەرمایشـتی: "لیعبـدون" بـۆ هۆکارییـە و ئـەم هۆکارییـەش بـۆ روونکردنـەوەی داناییە لە بەدیهێنان. هۆکـاریی پەیوەسـت نییـە بـە هۆکـارەوە، واتـە بریتییـە لـە ویستی شەرعی نەك گەردوونیی ئەندازەگیریی، چونکە ئەگەر وا بووایە، ئەوە دەبوو سەرجەم بەدیهێنراوەکان بەندەی ئەو بوونایە و بیانپەرستایە، کە ئەمـەش وا نییـە، بــەڵکو هۆکــاری ئامانجییــە و پێویســت نییــە. چــونکە هۆکــاری ئامــانجییش بــۆ روونکردنەوەی ئامانج و مەبەسـتە لـە کردارەکـە، بـەڵام رەنگـە روو بـدات و رەنگـە

[1] ابن تيمية، كتاب العبودية، تحقيق: على حسن على عبد الحميد الحلبي، دار الاصالة، الاسماعيلية، ١٤١٩هـ ص١٩.

روویش نەدات، وەك: قەڵەمەکەم دادا بۆ ئەوەی پێی بنووسم، رەنگە بنووسیت و رەنگە نەشنووسیت. هۆکاری پێویست واتە: ئەنجامی هۆکارەکە لەسەر هۆکارەکە دەوەستێت و دەبێت روو بدات و لەپێشیشیەوە روو بدات و پەیوەستە پێیەوە. بۆ وێنە: پەنجەرەکە شکا بە هۆی زۆریی گەرماوە. فەرمایشتی: "الا لیعبدون" واتا کراوە بە: الا لیوحدون(تەنها بۆ ئەوەی بە تاك و تەنهای بزانن)، ئەمەش راستە، واتاش کراوە بە: ملکەچ دەبن بۆی بە فەرمانبەرداری و جێبەجێکردنی فەرمانەکان و وازهێنان لەوانەی رێگریی لێ کراوە و لە پەرستنیشی ئەوەیە کە بە تاك و تەنها بزانرێت و ئەمەش دانایی(حیکمەتی) بەدیهێنانی پەری و مرۆڤە[1]. مەبەست — خواش زاناترە— تەنها بەرپاکردنی پەرستنەکان نییە بە وتە و کردار لە کاتە زانراوەکانی پەرستن، بەڵکو ئامانج لە بەدیهێنانی مرۆڤ و پەری ئەوەیە کە پەرستن حاڵەتی بەردەوامیان بێت و سیفەتێکی هەمیشەییان بێت و ساغ بۆ خوا بێت، واتە یەکخواپەرستی لە پەرستراوێتیدا، لە بەتەنها خواپەرستی و هاوبەش بۆ دانەنانی.

مرۆڤ پێویستە هەموو کردار و هەڵسوکەوتەکانی بەو شێوەیە بێت کە یاسادانەر فەرمانی پێ کردووە، بێ جیاوازی خستنە نێوان ئەوانەی پێیان دەوترێت پەرستن و ئەوانەی لە زاراوەدا پێی دەوترێت خوو یان مامەڵە و روونکردنەوەی ئەوەی کردارە شەرعییەکان هەمووی پەرستنن و هەروەك لەسەر موسوڵمان پێویستە نوێژ بکات بە شێوەی شەرعیی خۆی، هەر بەو شێوەیەش لەسەریەتی کڕین و فرۆشتن بکات بە شێوازە شەرعییەکەی، بەکورتی ئەوەی کە پەرستنەکان هەموو کردارە شەرعییەکان دەگرێتەوە، بەم واتایە شتێکە نابێت راجیایی لەسەر بێت، چونکە کۆکە لەگەڵ

[1] العثیمین، محمد بن صالح، القول المفید علی کتاب التوحید، تحقیق سلیمان بن عبد الله بن حمود ابالخیل، وخلد بن علی بن محمد المشیقح، ط الأولی، دار العاصمة، ١٤١٥هـ ـ ص ١٩ ـ ٢٠.

**فەرمایشتی خودا:** ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لَا شَرِيكَ لَهُۥ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾﴾ [سورة الأنعام:١٦٢-١٦٣].

**و فەرمایشتی:** ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾﴾ [سورة الذاريات:٥٦]. **بۆیە هەر کردارێك خوا خۆشی بوێت و خاوەنەکەی مەبەستی پاداشت بێت و بەو شێوەیە بوو کە داواکراوە، ئەوە پەرستنە**[١].

**کە پەرستن مەبەستی بەدیهێنەر بێت لە بەدیهێنان، ئەوا بەندایەتی مەبەستی بەدیهێنەرە لەناو بەدیهێنان، هەر ئەویشە -واتە بەندایەتی- مەبەستەکانی پەیوەندیی نێوان پەرستن و بەندایەتی و پەیوەندیی نێوان پەرستن و بەندایەتی ڕوون دەبێتەوە پاش زانینی جیاوازیی نێوانیان، لە (شێخ صالح الفوزان)یان پرسی: جیاوازیی نێوان پەرستن و بەندایەتی چییە؟ وەڵامی دایەوە: "جیاوازی هەیە لەنێوان پەرستن و بەندایەتی، پەرستن بریتییە لە: جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا لە فەرمانبەرداریییەکان و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکان. هەرچی بەندایەتیشە: واتە فەرمانبەرداریی بەدەمەوەچوون و پابەندبوون، ئەمەیان ڕوو لە کەسەکان دەکات، خەڵکی هەموویان بەندەی خودان، بەڵام هەیانە بەندایەتییەکەی بۆ خودا بە ویست و ئارەزووی خۆیەتی، ئەوانیش باوەڕدارانن، هەشیانە بەندایەتییەکەی ناچارییە، بە واتای دەکەوێتە ژێر ئەندازەگیرییەکانی خودا و حوکمەکانی و ئەوانەی بەسەریدا دێت، بۆیە ئەو بەندەیی خوداییە، بەندەییەکی گشتیە." خودا دەفەرموێت:** ﴿إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا﴾ [سورة مريم:٩٣] **. واتە: "هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هەموویان دەگەڕێنە بۆلایە خودا بەبەندایەتی."**

[١] آل سعود، سطام بن عبد العزيز، نفس المصدر، ج الاول، ص ٣٨٥.

هـــەموویان بەنـــدەی خـــودان، بـــەڵام هەیانـــە بەندایەتییەکـــەی بـــژاردە و فەرمانبەرداریی خۆیەتی و ئەمەش داواکراوە، هەشیانە بەندایەتییەکەی ناچاری و دەرەوەی ویستی خۆیەتی، فەرمانبەرداریی خۆی نییە، بەڵکو بەندەی خودایە بە واتای هەژاری، ئەوەیە کە لای خودایە و ئەوەی بەسەر ئەوانی تریشدا دێت بەسەر ئەویشدا دێت و ئەنجامەکەشی بۆ لای خودایە و لەدەستی دەرناچێت[1].

## مەبەستی بەدیهێنەر لەناو بەدیهێنان

مەبەستی بەدیهێنەر لە بەدیهێنان، بریتییە لە (بەندایەتی) بە هەڵبژاردنی خۆیان، بێ خۆبەگەورەزانین و خۆبچووککردنەوە. بەندایەتی، بێ خۆبەگەورەزانین یان خۆبچووککردنەوە، پێویستی بە (باوەڕ)ە، چونکە ئەو بیروباوەڕەی بەڵگەی بۆ هێنراوەتەوە، و واتای بەندایەتی دەهێنێتە دی لەدوای ئیسلام، باوەڕهێنانە بە خودا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی و ئەندازەگیریی چاك و خراپی. خودا دەفەرموێت: ﴿ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤﴾ [سورة الحجرات:١٤].

باوەڕی ڕاستیش ئەوەیە کە گوێڕایەڵیی ئاشکرای تێدا بێت، تا داوای (وەرگرتن)ی پێ بکرێت لە خودای گەورە لە پەرستن و فەرمانبەرداری کە داوا کراوە، بێتە دی لە هەر تاکێك لە تاکەکانی بەدیهێنراوان، بە جۆرێك کە بچێتە سەرووی جێبەجێکردنێك کە تەنها پێویستەکان لەکۆڵ دەخات و زیادی دەکات بۆ بەدەستهێنانی پاداشت. مرۆڤ لە سەرەتادا دەیەوێت لە گوناه دوور بکەوێتەوە،

---

[1] الفوزان، صالح الفوزان، شرح رسالة العبودية لابن تيمية، اعتنى بها فهد ابراهيم الفعيم، ط الأولى، ١٤٣٥هـ دار ابن الجوزي، الرياض، ص١١.

پاشان پاداشت بەدەست بهێنێت، ئەمەش لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا کۆکە و لەگەڵ ڕێسای: "دوورخستنەوەی خراپە لەپێشترە لە بەدەستهێنانی بەرژەوەندی[1]." بەڵام هەیە لەمانە بەرزترە و لە مەبەستیشدا پێداگریی زیاتری لەسەر کراوە، ئەویش بەدیهێنانی پلەی (وەرگیران)ە.

بەندایەتی تەواوترین پلەی گوێڕایەڵیکردنە، بەندایەتی لە مەبەستەکانی بەدیهێنەرە لە بەدیهێنان، ئەویش مەبەستی پەرستنە و بنچینەی یاسادانانیەتی، ئەویش پلەیەکە خودا کردوویەتی بە وەسف بۆ پێغەمبەران –بژاردەی ناو بەدیهێنراوەکانی دروودی خودا لەسەر هەموویان– و بۆ تەواوترینی بەدیهێنراوەکانی پێغەمبەری ئەمین، محەمەد (درورد و سەلامی خودای لەسەر بێت).

(ئیبن تەیمییە) دەڵێت: "خودا وەسفی بژاردەترین بەدیهێنراوی خۆی کردووە بە بەندەی خۆی[2]." (ابن القيم الجوزية[3]) دەڵێت: "خودا بەندایەتیی کردووە بە وەسف بۆ تەواوترینی بەدیهێنراوەکانی و نزیکترینی لە خۆی." بۆیە دەفەرموێت: ﴿لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴾ [سورة النساء:١٧٢] و دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ ۩ ﴾ [سورة الأعراف:٢٠٦]، ئەمەش روونی دەکاتەوە کە وەستانی تەواو لە فەرمایشتی: ﴿ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَنْ عِندَهُۥ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ

[1] آل سعود، عبد العزيز بن سطام، المرجع السابق ص٣٨٧.

[2] ابن تيمية، المرجع السابق، ص٢١.

[3] ابن قيم الجوزية(٦٩١ ـ ٧٥١هـ)، مدارج السالكين بين منازل اياك نعبد واياك نستعين، دار الكتب العلمية، بيروت ـ لبنان ـ ط الأولى، ج١ ـ ص١١٥ ـ ١١٧.

﴿وَلَا يَسۡتَحۡسِرُونَ﴾ [سورة الأنبياء:١٩]، **پاشان دەست پێ دەکاتەوە:** ﴿يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفۡتُرُونَ﴾ [سورة الأنبياء: ٢٠]، **ئەمە دوو رستەی تەواو و سەربەخۆن، واتە ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدان بەندە و موڵکی ئەون، پاشان رستەیەکی دیکە دەست پێ دەکاتەوە و دەفەرموێت: "ئەو فریشتانەی لای خۆین، خۆ بە گەورە نازانن لە پەرستنی خودا و لووتی لێ ناکەن –لێی بێزار نابن–، خۆیان گەورە ناکەن و ئاخیش هەڵناکێشن، تا سارد و ماندوو بن و لێی دابڕێن، دەوترێت: حسر و استحسر، کاتێك ماندوو و شەکەت بوو، بەڵکو پەرستن و یادکردنیان وەك هەناسەیە بۆ نەوەی ئادەم، هەروەها دەفەرموێت:** ﴿وَوَهَبۡنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيۡمَٰنَۚ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ٣٠﴾ [سورة ص:٣٠]، **هەروەها لەبارەی مەسیحەوە دەفەرموێت:** ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ وَجَعَلۡنَٰهُ مَثَلٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ [سورة الزخرف:٥٩]، **جا ئامانجەکەی کردە بەندایەتی نەك پەرستراوێتی، وەك ئەوەی گاورە دوژمنەکانی –واتە دوژمنی مەسیح– دەڵێن**[1]. **وەسفی بەڕێزترین و پلە بەرزترینی بەدیهێنراوەکانی کردووە بە بەندایەتی لە بەڕێزترین پلەدا، کە دەفەرموێت:** ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٣﴾ [سورة البقرة:٢٣] **و دەفەرموێت:** ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ

---

[1] لێرەدا نووسەر گشتگیرییەك دەکات سەربارەت بە گاورەکان کە ورد نییە، چونکە لەناو گاورەکاندا خەڵکانێکی زۆر هەن کە تەنها خودا دەپەرستن و عیسا تەنها وەك پێغەمبەرێك دەناسن نەك وەك پەرستراو، بەڵام بەشێکی گەورەی ئەم جۆرە گرفتانە لەوەدایە کە راگەیاندن تەنها ئەوانە دەردەخات کە باسی خاچ و پەرستنی عیسا دەکەن و ئەمەش وێنەیەکی دروستی ناو گاورەکان نییە، هەر وەك چۆن لەناو موسوڵمانانیش بۆ خەڵکانی رۆژئاوا گروپە پەڕگیرەکان دەردەخرێن و موسوڵمانان دەڵێن ئەوانە وێنای ئیسلام ناکەن و دوورن لە ئیسلام. (وەرگێڕ)

لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ [سورة الفرقان:١] **هەروەها دەفەرموێت:** ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ﴾ [سورة الكهف:١]، **بۆیە ناوی بردووە بە بەندە لە پلەی ناردنە خوارەوەی کتێبەکەی و لە پلەی کێبڕکێ کە بتوانن هاوشێوەی بهێنن و دەفەرموێت:** ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾﴾ [سورة الجن:١٩]، **بۆیە بە بەندە باسی دەکات لە پلەی بانگکردن بۆ لای خۆی و دەفەرموێت:** ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾﴾ [سورة الإسراء:١]، **بۆیە بە بەندە باسی کردووە لە پلەی شەوڕەوی. لە فەرموودەی صەحیحدا[1] هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "لا تطروني كما اطرت النصارى المسيح ابن مريم فانما انا عبد، فقولوا عبد الله و رسوله." لە فەرموودەدا هاتووە: "انا عبد، آكل كما يأكل العبد، أجلس كما يجلس العبد[2]." لە فەرموودە صەحیحەکانی ئیمامی بوخاریدا هاتووە لە (عەبدوڵلای کوڕی کوڕی عمرو) فەرمووی[3]: "قرأت في التوراة صفة محمد صلى الله عليه و سلم: محمد رسول الله، عبدي و رسولي، سميته المتوكل، ليس بفظ و لا غليظ، و لا صخاب بالاسواق، و لا يجزي بالسيئة السيئة، و لكن يعفو و يغفر[4]."**

---

[1] اخرجه البخاري، الجامع الصحيح، بيروت ـ دار طوق النجاة ـ ط ١ ـ ١٤٢٢هـ (٣٤٤٥/١٦٧/٤) و(١٦٨/٨ـ١٧٠ـ ٦٣٨٠)من حديث ابن عمر.

[2] رواه ابن سعد، الطبقات الكبرى، تحقيق، علي محمد عمر، ط١، ١٤٢١هـ القاهرة ـ مكتبة الخانجي، ٣٢٨/١ من حديث عائشة بسند ضعيف، بە چەند ڕێگەیەکی تری لاواز هاتووە، وەك لەسەرچاوەی پێشوودا هاتووە ٣١٩/١. ئەلبانی بە تێکڕا بە صەحیحی زانیوە لە سلسلة الاحاديث الصحيحة، ١٤١٥÷ الرياض، مكتبة المعارف، ٨٢/٢/ رقم٥٤٤.

[3] البخاري، سەرچاوەی پێشو. (٦٦/٣ـ ٦٧ رقم ٢١٢٥) و (١٣٥/٦ ـ ١٣٦ رقم ٤٨٣٨) لە ئیبن عەمرەوە.

[4] ابن قيم الجوزية، س.ث. ج١ لا ١١٥ ـ١١٧.

**مەبەستی بەندایەتی بە بژاردە (إختیارا) وەك بەندایەتی بەناچاری(اضـطرارا)[1]:**

مەبەستی شەرعی لە بـەدیهێنانی بـەدیهێنراوەکان بریتییـە لـە دەرهێنـانی مـرۆڤ لـە داخوازیی ئارەزووەکانی، تا بەندەی خودا بێت بە بژاردەی خۆی، هـەروەك بەنـدەی خودایـە بەناچـاری[2]. مـرۆڤ بـۆی هەیـە بـە هەڵبـژاردەی خـۆی بەندایـەتیی خـودا هەڵبژێرێت و ئەمەش کۆکە لەگەڵ سروشتی، بە هۆی بنەڕەتی بەدیهێنانـەوە و ئـەم بژاردەیـەش بـەوە دەبێـت کـە فەرمانبـەرداریی فەرمانـەکانی خـودا بکـات و دوور بکەوێتەوە لە قەدەغەکانی و بۆی هەیە پێچەوانەی بەندایەتیی خوداش هەڵبـژێرێت، ئەمەش دژی سروشتیەتی، چونکە بە هۆی بەدیهێنانەوە بەندەی خودایە بەناچاری، ئەگـەر بـژاردەی خـۆی نەخاتـە گـەل ئـەو بەندایەتییـە ناچـارییە، ئـەوە کـرداری پێچەوانەی سروشتیەتی.

ئەمەش لەبەر ئەوەی کردارەکانی مرۆڤ لە بنەڕەتـدا بـە ویسـتی خۆیـەتی و ئـەم ویستەش بەندە بە پێچەوانەنەبوون لەگەڵ شەرع و ئەنجامنەدانی هـەر شـتێك، ئـەم ویستە هەڵدەوەشێنێتەوە لە وتە و کردار و بیروبـاوەڕ. بەدەسـتهێنانی پاداشـت بـۆ مرۆڤ لەبەرامبەر کاری چاکە، وا دەخوازێت کە ویستی خۆی ئازاد بێت، بۆیە دەبێـت بوارێك هەبێت بۆ مرۆڤ کـە ئـازاد بێـت تیایـدا، مـرۆڤیش ئازادییەکـەی سـنووردارە و

---

[1] لەم توێژینەوەیەدا دەستەواژەی(إجبارا) مان بەکار نەهێناوە، وەك لەم جۆرە بابەتانـەدا بـەکارهێنانی باوە، چونکە زانایانی سەلەف پێیان وایە وشەی(جەبر) لە قورئان و سـوننەتدا نـەهاتووە و بـەکارهێنانی ترسی ئەوەی هەیە ستەم بدرێتە پاڵ پەروەردگار. بڕوانە:

ـ ابن تيمية، درء تعارض العقل والنقل، ط ١، تحقيق محمد رشاد سالم، الرياض، جانعـة الامـام محمـد بـن سعود الإسلامية(١/٦٧).

ـ ابن القيم الجوزية، شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر والحكمة والتعليل، تحقيـق: محمـد بدرالـدين أبـو فراس، (٢/٦٢٩)دار الفكر، بيروت، ١٣٩٨هـ ـ١٩٧٨م،

[2] الشاطبي، ٢/٢٨٩

ڕەها نییە و ئـازادییش بـەوە دەناسـرێت چـاوگی فرمـانی چـاکەیە، ئـەویش لەسـەر کێشی (فعّل)یە و زانراوە چاوگی ئەو فرمانەش لەسـەر کێشـی (تفعیـل) دێـت. ئـەم فرمانەش (خیّر)، فرمانێکی سێ پیتییە و پیتێکی بۆ زیاد کراوە، هەر لەم جـۆرەش (خار یخـیر) هەیـە و هـەر لـەمیش (اختـار یختـار) و ناویشـی نـراوە چـاکە، چـونکە لەنێوان دوو شتدا چاکەکەیان هەڵدەبژێرێت، یان باشتریان هەڵدەبژێرێت.

ئەمەش گێڕانەوەی عاقڵە بۆ لای بژاردەی خۆی و گەر ویستی دەیکات و ویستیشی نایکات[1]. بنەڕەت لە ئازادیدا ئەوەیە سنووردارە، ئازادیی ڕەها تەنها بۆ خودایە، سەرجەم کارەکانی خوداش چاکەیە و شتێك نییە خودا ناچار بکات و شتێك نییە وا لە خودا بکات بەزۆر کارێك بکات، چونکە ئەو: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ﴾ [سورة الأنبياء:٢٣]. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾﴾ [سورة القصص:٦٨]. دووپاتکردنەوەی ئەمەش لە (فتح القدیر) هاتووە کە مەبەست لەو ئایەتە: خودا (سبحانە و تعالی) ڕوونی کردووەتەوە بۆ بەندەکانی ئەوەی پرسیاری لێ دەکرێت لەسەر کردارەکانی، بەکەڵکی پەرستراوێتی نایەت، وەك مەسیح و فریشتەکان[2]. کەس بۆی نییە سەرپێچیی فەرمانی خودا و پێغەمبەرەکەی هەڵبژێرێت، لەبەر ئەوەی خودا دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴾ [سورة الأحزاب:٣٦]. بۆیە بژاردەی مرۆڤەکان بەستراوەتەوە بە کۆکبوونی لەگەڵ فەرمانی

[1] الطوفي، شرح مختصر الروضة، مرجع سابق، ١/٢٥١.

[2] الشوكاني، فتح القدير، الجامع بين فني الرواية والدراية من علوم الحديث، ط ١، المنصورة، مصر، دار الوفاء، ١٤١٤هـ ـ ١٩٩٤م. ٣/٤٠٢.

یاسادانەر، هەر وەك كۆكبوون لەگەڵ فەرمانی یاسادانەر بەستراوە بە بەرزترینی كۆكبوون، بەمەش هەڵبژاردەی مرۆڤ سەر دەكێشێت بۆ ڕازیبوونی خودا و بژاردەیان بە شوێنكەوتەی فەرمانی دەبێت و ڕێكردنیان بەپێی شەریعەتەكەی، تا بەدیهێنانی بەندایەتی بە ویستی خۆیان وەك ئەوەی بەندەی ئەون بەناچاری[1]، چونكە سەرجەم كارە ڕێگەپێدراوەكان -ئەگەرچی لە ڕووكەشدا دەچێتە ژێر ویستی مرۆڤەوە- چووەتە ژێر ویستی مرۆڤەوە بە هۆی ئەوەی یاسادانەر خستویەتیە ژێر ویستیەوە. ڕێگەپێدانی ڕێگەپێدراوەكان، ناخوازێت بچێتە ژێر ویستی مرۆڤەوە مەگەر بە بڕیاری خودا. كە ئەمەش بەم جۆرە بێت، ئەوا ویستی مرۆڤ دەرئەنجامی ئەوەیە كە خودا دایناوە بۆی و ئامانجیشی وەرگیراوە لەو لایەنەوە كە یاسادانەر ڕێگەی پێ داوە، نەك ئەوەی خۆڕسك بێت، ئەمەش خودی دەرهێنانی مرۆڤە لە شوێنكەوتنی ئارەزووی بۆ بەندایەتی بۆ خودا[2].

ڕێگەپێدرانی -مەشروعیەتی- سەرجەم بژاردەی بەندەكان لە شەرعدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەندازەی هاوبەشی بەندایەتی تێیاندا، ئەگەرچی بە ڕێژەی جیاوازیشە و ئەو بژاردانەش پەیوەست بن بە ژیان و كاری دنیاییيان.

ڕەنگە ئەمەش مەبەستی (الشاطبي) بێت كە دەڵێت: **"هەرچی واتایەكی تێدا سەلمێنرا بەبێ بەندایەتی، ئەوە دەبێت بەندایەتیی تیادا لێك بدرێتەوە[3]."** (القرافي) كە دەڵێت: **"هیچ مافێكی بەندە نییە، مەگەر مافێكی خوداشی تێدایە[4]."** بەمەش هەموو داخوازییەك بووە مافی خودا، چونكە ئەوەی هی خودا بێت، ئەوە هی ئەوە و

[1] الشاطبي، الموافقات، ٢/١٦٨. و: العالم، المقاصد العامة للشريعة الإسلامية، ص٩.
[2] الشاطبي، الموافقات، ١/١٦٨ وما بعدها. و اللخمي، التعليل بالمصلحة عند الأصوليين، ص٧٤.
[3] الموافقات/٢/٥٢٩.
[4] الفروق، ١/٢٥٦.

ئەوەش هی بەندەیە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا لەو لایەنەوە کە مافی خودای تیایە و لەو لایەنەشەوە کە مافی بەندەش لە مافی خوداوەیە، ئەگەر هی خودا بوو، ئەوە مافی بەندەی تیا نییە لە بنەڕەتدا. بەم پێیەش شەریعە بنچینەی مافە تایبەتەکانە و مافە تایبەتەکان بنچینەی شەریعە نین و مافیش بەخشش نییە لە کۆمەڵگەوە یاخود لەو یاسایەوە کە نەتەوە دایدەنێن و مافێکی سروشتییش نییە بۆ خاوەنەکەی، بەڵکو بەخششێکی خوداییە داویەتی بە مرۆڤ لە بەخشندەیی خۆیەوە، بۆ ئەوەی بەرژەوەندییە دنیایی و دواڕۆژییەکانی پێ بێنێتە دی[١]. دەکرێت بڕوانینە وتەی (القرافي): "لا يوجد حق للعبد الا و فيه حق لله تعالى." لە چوار لایەنەوە کە وێنای پەیوەندیی نێوان پەرستن و بەندایەتیمان بۆ دەکات، ئەوانیش:

یەکەم: مەبەست لە پەرستن(عیبادەتکردن) بەندایەتی کردنە.

دووەم: مەبەستیش لە بەندایەتی کردن عیبادەت کردنە.

سێیەم: هەڵبژاردنی بەندایەتی لە پەرستندا خۆویستانە، ئەوە مەبەستی بەندایەتیکردنە وەك پێویستییەك بۆ بەندەکان.

چوارەم: هەڵبژاردنی چاوەڕوانکردنی پاداشتوەرگرتن لەسەر خووە ڕێگەپێدراوەکان خۆویستانە، مەبەستە لە پەرستندا.

لەبەر ئەوە مەبەستی مرۆڤ لە سەرجەم هەڵسوکەوتەکانی، بیروباوەڕ و وتە و کردار[٢]، ئەوە حسابی لەسەر دەکرێت لە هەڵسوکەوتەکانی پەرستن و مامەڵەش، هەر ئەمەشە جیاوازی دروست دەکات لەنێوان خوو و پەرستن، لە پەرستنەکانیشدا: لەنێوان پێویست و ناپێویست، لە خووەکانیش: لەنێوان پێویست و سوننەت و ڕێپێدراو و نەخوازراو و قەدەغەکراو و ڕاست و پووچەڵ، حوکمەکانی تری جگە

---

[١] الموافقات، ٢/٥٣٥ ـ٥٣٦(بەدەسکارییەوە).

[٢] الخادمي، الاجتهاد المقاصدي، ج١ ـ ص٥٣.

لەمانیش. ئەمە لە لایەك، لە لایەكی ترەوە دەبێت مەبەستی مرۆڤ كۆك بێت لەگەڵ مەبەستی یاسادانەر لە تەكلیفدا. ئەمەش ئاشكرایە لەو لایەنەوە كە مرۆڤ بۆ بەندایەتیی خودا بەدی هێنراوە و ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ كاركردن بەپێی مەبەست لە دانان —ناردن—ی شەریعە.

هەموو ئەمەی تێپەڕی، ئەوە دەخوازێت كە مەبەستەكە بریتی بێت لە گۆڕینی سەرجەم خووەكانمان بۆ پەرستن و هێشتنەوەی پەرستنەكانیشمان وەك پەرستن.

بەم پێیەش هیچ خوویەك (ڕێگەپێدراو بێت یاخود قەدەغەكراو یاخود نەخوازراو) نییە، نەتوانرێت بگۆڕێت بۆ پەرستن. ویستی جێبەجێكردنی ئامانج و مەبەستی شەرعی لە خووەكان، بریتییە لە گۆڕینی بۆ پەرستن. هەروەك هیچ پەرستنێكیش نییە كە وای لیَ نەیەت بگۆڕێت بۆ خوو، ویستی جێبەجێكردنی ئامانج و مەبەستی شەرعی لە پەرستنەكان، بریتییە لە جێبەجێكردنی وەك پەرستن نەك خوو.

بەڵگەش لەسەر ئەمە، دەرنەچوونی هیچ كردارێك لە كردارەكانی مرۆڤە لەم ئایینە، چونكە هەر كردارێك مرۆڤ پێی هەڵدەستێت، حوكمێكی شەرعیی هەیە، ئەو حوكمانەش پێویستە یاخود سوننەتە یاخود ڕێپێدراوە یاخود نەخوازراوە یاخود قەدەغەیە، هەر كردارێكی پەسەند لە شەرعدا بۆ ئەوەیە كە هۆكارێكی پەرستنی خودایە وەك مەبەستی یەكەم، ئەگەر هەر بابەتێكی تری تێدا دەركەوت، ئەوە شوێنكەوتەی یەكەمە و مەبەستی دووەمە، خوا دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لَا شَرِيكَ لَهُ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾﴾ [سورة الأنعام:١٦٢-١٦٣]، مەبەستیش گرتنەخۆی سەرجەم ماوەی ژیانە بیَ پچڕان، (ابن عاشور) دەڵێت: "كارەكانی ژیان زۆر و زەوەندە، كاری كاتی مردنیش ئەوەیە كە لە ماوەی ژیانی ئەنجامی داوە و لەسەری چەسپاو بووە... ڕەنگە كەسێك كارێكی كردبێت لە ماوەی لەشساغی نەیكردبێت، وەك خۆپاراستن یاخود شەرم

یاخود بەدەستهێنانی سوودێك، دواتر بێئومێد بووە لەوەی پێشتر ڕەچاوی کردبوو و کارێك ئەنجام دەدات پێشتر نەیدەکرد. ئەو بارەش بارودۆخێکی تایبەتی هەیە، لەو کاتەدا ڕوو دەدات وەك وەسیێتکردن، هەموو ئەمانەش لە بارەکانی کۆتاییی ژیانن، بەڵام دەدرێتە پاڵ مردن بە هۆی نزیکییەوە لێی، بەمەش مەبەست لە ناوهێنانی مردن، گرتنەخۆی سەرجەم ماوەی ژیانە تا کاتی نزیکی مەرگ[1]."

١- هەروەها دەڵێت: " مەبەست لە بەدیهێنانی واتای ئیسلام(الإسلام) ئەوەیە کە هەموو ژیانی موکەللەف لەپێناوی خودادا بێت، بۆیە فەرموویەتی: 'و محیای و مماتی لله رب العالمین' بەم فەرمایشتەش واتای ملکەچی دەهێنێتە دی کە بنەڕەتەکەی ڕادەستبوونی خۆتە، ئەوەش ئەو واتایەیە کە لە فەرمایشتی خودا: ﴿فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسْلَمْتُمْۚ فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ ٱهْتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلْعِبَادِ ٢٠﴾ [سورة آل عمران:٢٠] وەردەگیرێت و ئەمەش واتای ئەو لادانە لە شیرك بەرەو یەکتاپەرستییەی -الحنیفیة- کە خودا دەربارەی (إبراهیم- علیه السلام) باسی لێ فەرمووە لە فەرمایشتی: ﴿إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٣١﴾ [سورة البقرة:١٣١][2] ".

١- دەبێت کردار بەپاکی بۆ خودا بێت، نەك جگە لەو. (ابن عاشور) دەڵێت: "فەرمایشتی: 'لرب العالمین' سیفەتێکە ئاماژەیە بۆ هۆکاری شیاوبوونی بەوەی کە کرداری بەدیهێنراوەکانی بۆ ئەو بێت و بۆ جگە لەو نەبێت، چونکە جگە لەو کەسی تر توانای بەدیهێنانی نییە، هەروەك ئاماژەی پێ داوە لەم فەرمایشتەدا: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ

---

[1] ابن عاشور، تفسیر التحریر والتنویر، تونس، الدار التونسیة، ١٩٨٤م، ج٨ ـ ص٢٠٢.

[2] سەرچاوەی پێشوو،لا ٢٠٣.

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ١﴾ [سورة الأنعام: ١]"[1].

١- ئەوەش کە هەموو ساتێکی ژیانی مرۆڤ، بنەڕەت ئەوەیە کە بەشێك بێت لەو پەرستنەی واتای (الإسلام) دەهێنێتە دی و ئەوە دەخوازێت کە دەتوانرێت هەموو کار و خوویەك بگۆڕێت بۆ پەرستن و ئەمەش لە توانای مرۆڤدا هەیە، چونکە خودا داواکارییەك ناکات لە توانای مرۆڤدا نەبێت، خودا دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٤٢﴾ [سورة الأعراف:٤٢]. و تەنها ئەو کارانەی دەتوانرێت، لە مرۆڤ داوا کراوە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە لە بنەڕەتدا هەموو کارێك دەگۆڕێت بۆ پەرستن، بە مەبەستی کردنی بە ڕێگەپێدراوەکان و خواستنی پاداشت لە سەرجەم کردار و گوفتارەکان.

## مەبەستەکانی یاسادانانی یاسادانان

### مەبەستی یاسادانەر لە یاسادانانی یاساداناندا دەبێت بە دوو بەشەوە:

مەبەستی یاسادانەر (لەناو) یاسادانان، ئەویش: ئەوەیە کە بەدیهێنانی مەبەستە بۆ هەر تاکێکیان، مەبەستی یاسادانەریش (لە) یاسادانان: ئەو شتەیە کە ویستراوە لە سەرەتا و کۆتایی یاسادانانی یاسادانان.

(الشاطبي) -رەحمەتی خودای لەسەر بێت- لە کتێبەکەیدا (الموافقات) مەبەستەکانی کورت هەڵهێناوە لە چوار جۆردا: مەبەستی یاسادانەر لە دانانی یاسا لە سەرەتادا، دانانی شەریعە بۆ تێگەیاندن، دانانی شەریعە بۆ تەکلیف بەگوێرەی

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٣.

شــەریعەت و مــرۆڤ بچـێتە ژێـر حوکمــەکانی شــەریعەوە[1]. (ابــن عاشــور) هــەمان دابەشکردنی بەکار هێناوە لە کتێبەکەیدا کە لەسەر مەقاصید نووسیویەتی[2].

ملکەچی(الإسلام) مەبەستی یاسادانەر بووە لە یاسادانان، ئەو ئایینەی پەرستنی کردووە بە یاسا ئیسلامە، ئەویش: ملکەچیی خودایـە بـە یەکخواپەرسـتی، پابەنـدی بۆی بە فەرمانبەرداری و ئەستۆپاکی لە هاوبەشدانان و هاوبەشدانەران و گەواهیـدان کە جگە لە خـودا هـیچ پەرسـتراوێکی ڕاسـتی تـر نییـە و محەمـەدیش ڕەوانـەکراوی ئەوە، نوێژ بەرپاکردن و زەکاتدان و ڕەمەزان بەڕۆژووبوون و حەجکردن بۆ کەسـێك کە بتوانێت.

ملکەچــیی خــودا بــە یەکخواپەرســتی و پابەنــدی بــۆی بــە فەرمانبــەرداری و ئەســتۆپاکی لــە هاوبەشــدانان و هاوبەشــدانەران بــە واتــای مەبەســت، واتاکەشــی بەتەواوی (مەبەستی قسەکەرە)، واتە ئـەو نیەتـەی قسـەکەی پـێ دەکـات، چـونکە مەبەستەکە لێرەدا ناخ و هەستی قسەکەرە کە هاوکاتە لەگـەڵ کـات یـاخود شـوێنی قسەکە، ئەگەر ئەم ناخ و هەستەشی لەگەڵ نەبوو، ئەوا هەڵەیە، بەم پێیەش ئەگـەر وترا: (مەبەستەکانی شەریعە)، ئەوە واتاکەی بریتییە لە: (مەبەستەکانی یاسـادانەر و مەبەسـتەکانی مـرۆڤ[3]). کاتێـك زانسـتی مەبەسـتەکان زانسـتێکی ڕەوشـتی (علـم اخلاقی) بێت، کە بڕوانێتە مەبەستی یاسادانەر و مرۆڤ، ئەوا پێویستە پایەیەکی تری

---

[1] الموافقــات ج ١، ل٢٠٠. و الخــادمي، الاجتهــاد المقاصــدي، ج١، ل٥٣. العــزاوي، المــدخل الى علــم المقاصد(٥/١) سەرچاوەی پێشوو.

[2] بين علمي أصول الفقه والمقاصد، ص١٢٧.

[3] شاتیبی بابـەتی (مەبەسـتەکانی)لە چـەند بابەتێکدا لـە پـەرتووکی مەبەسـتەکاندا بـاس کـردووە، کـە بریتییە لە جۆری سێهەم لە بەشی یەکەم بە ناونیشانی(مەبەستەکانی شەریعەت لەتەکلیفدا)، وە جـۆری چوارەم لە بەشی یەکەم بەناونیشانی(مەبەستەکانی دانانی شـەریعەت بـۆ گـوێڕاڵی)، لەکۆتایشـدا بەشـی دووەم بە ناونیشانی(مەبەستەکانی موکەللەف).

هەبێت، ئەویش تیـۆرەی نیەتەکانـە و ئـەم تیـۆرەش تایبەتـە بـە گـەڕان لـە لایەنـە ڕەوشـتییەکانی ئـەم مەبەسـتە تەکلیفییانـە و ئـەمیش لـە خولگـەی دوو چـەمکی بنەڕەتی دەسووڕێتەوە، ئەوانیش: (ویست) و (دڵسۆزی[1])ن.

ویست و دڵسۆزییش، خوازەی پەلەکردنن لە ڕاپەڕاندنی ئەوەی لە ئەستۆدایە بـە وازهێنـان لـە قەدەغە(حـەرام) پاشـان نـەخوازراو(المکروه) و ئەنجامـدانی ئـەوەی فەرمان بە کردنی کراوە(واجب) پاشان سوننەتەکان.

مەبەستیش لە ڕاپەڕاندنی ئەوەی لە ئەستۆدایە(الذمة): بـەجێهێنانی ئەوەیـە کـە شـەرع لەسـەری پێویسـت کـردووە، مەبەسـت لـەوەش ئەنجامـدانی داخوازییـەکانی شەرعە، جا ئەوەش مافی خودا بێت یاخود مافی بەندە[2].

[1] العلواني، طه جابر، مقاصد الشريعة ١٣٥. ومقال (التوحيد والتزكية والعمران).

[2] الذمة: لە زمانی عەرەبیدا بە واتاکانی (پەیمان و ئەمان و کەفالەت و مـاف و حورمـەت) هـاتووە، بۆیـە ئەو ناوەشی لێ نراوە چونکە هەڵوەشاندنەوەی دەبێتە مایەی لۆمـە و زەم. لـە زاراوەشـدا بریتییـە لـە: شتێکیگریمانەکراو و تەقدیرکراوە بۆ مرۆڤ و بۆ بـەردەوامی و ڕێکخسـتنی لـۆژیکی ئەحکامـە فیقهییـەکان گریمانەکردنی پێویستە. کەواتە جێگایەکی ئیعتیبارییە لە کەسـێکی دیـاریکراودا کـە ئـەو مافانـە تێیـدا جێگیر دەبێت کە دەکەوێتە سەری. ابراء الشيء من الشيء: لە زمـانی عرەبیـدا بـەواتای پاکژکردنـەوەی شتێك لە شتێکی تر. دەوترێت: بريْ من المرض واتە: چاك بوویەوە، وبريء من الدين، واتە: قەرزەکەی لەکۆڵ بوویەوە. واسبرأت الشيء، واتە: تا کۆتایی شتێك بڕۆیت بۆ نەهێشتنی گومان لە تـەواوبوونی. وە دەوترێت: برأت من الشيء ابراء وبراءة، بۆ شتێك کە لەسەر خۆتی لاببەیت و پەیوەنـدی نێـوان خـۆت و ئەو شتە ببڕیت.زبڕوانە: مصطفى، ابراهيم واخرون، المعجـم الوسـيط، مجمـع اللغـة العربيـة، ط ٢، الادارة العامة للمعجمات واحياء التراث، استانبول، تركيا، المكتبة الإسلامية ٣١٥/١. المباركفوري، الشـيخ صـفي الدين وآخرون، المصباح المنير في تهـذيب تفسـير ابـن كـثير، ط٢ الريـاض، دار السـلام، ١٤٢٠هــ ـ ٢٠٠٠م، ص٢١٠. الفيروزابادي، القاموس المحيط، ٨/١ و ١١٧/٤. والزرقا، مصطفى أحمد، المدخل لنظرية الالتزام في الفقه الإسلامي، ط بدون دمشق، دار العلم ١٤١٩هـ ١٩٩٩م، ص٢٢٢. وأبو جيب سعدي، القاموس الفقهي لغة واصطلاحا، طبعة: بدون، دار الفكر، ١٤١٨هـ ١٩٩٨م. ص١٣٨. والفيومي، المصباح المنير، ص٤٦.

بنـەڕەتیش ئەسـتۆپاکییە پـێش تـەکلیف و سـەرقاڵی ئەسـتۆیە دوای تـەکلیف. (المنجور) دەڵێت: "بنەڕەت ئەستۆپاکییە پێش تەکلیف و سەرقاڵیی ئەسـتۆ، پـاش بەدیهاتنی تەکلیف و سەرقاڵی ئەستۆیش ئەسڵ نەبوونی ئەستۆپاکییە[1]." ئەستۆش لە سێ دۆخ (حاڵەت)پێکهاتووە:

یەکەم: ئەسڵ ئەستۆ پاکییە و خاڵیبوونیەتی لە هەر سەرقاڵییەك[2].

دووەم: هـــەر ئەســـتۆیەك هـــەر ئەســـتۆیەکی خـــاڵی بەهـــەبوونی تـــەکلیف پڕدەکرێتەوە.

سێهەم: ئەسڵ ئەوەیە هەر ئەستۆیەکی سەرقاڵ پێویستە خـاڵی بکرێتـەوە و بـە سەرقاڵی نەمێنێتەوە.

---

[1] المنجور، أحمد بن علي، شرح المنهج المنتخب الى قواعد المذهب، دراسة وتحقيـق: محمـد الشـيخ محمـد الامين، ط١، القاهرة، مكتبة ومطبعة دار الكتب العلمية، دون سنة الطبع، ص٥٥٣.

[2] ئـەم ڕێسـایە لـە هـەموو پەرتووکـە فیقهـی و پـەرتووکی ڕێسـاکاندا (القواعد)هەیـە، بـۆ نموونـە لـەم پەرتووکانەی ڕێساکاندا:

الاشباه والنظائر، ابن السبكي، ١/٣٣ ـ٣٧. الاشباه والنظـائر، السـيوطيص١٣٥. الاشـباه والنظـائر، ابـن نجيم ص٧٨. المجلة وشروحها – الاجابة الثامنة، اجابة السائل الامير الصنعاني ص١١٣.

وە لە پەرتووکە فیقهییەکاندا:

المبســوط للســرخي ٢٩/١٧. المهــذب للشــيرازي٢١٤/٢. القــوانين الفقهيــة لابــن جــزي١٩٧. الــذخيرة للقرافي١٥٧/١. المغني لابن قدامة ٨/٣٣٠. جامع الخلاف والوفـاق للقمـي٨٤/١. الخـلاف لـل\وسـي٤٦٦/١. اللبحر الزخار لابن المرتضي٢٦٠/٣. التاج المذهب للعنسي ٢٥٦/١. شرح النيل لأطيفـيش٣٦/١٣. السـيل الجرار للشوكاني٣٢١/١. قواعد الأحكام٣٢/٢. انظر: معلمة زايد للقواعد الفقهية والأصولية.

هەروەها بڕوانە:

ـ حاشية العبادي على المنثور في القواعد للزركشي٧٨/١.

ـ تبيين الحقائق للزيلعي١٣/٥.

ـ شرح المجلة للاتاسي٥٥٦/٤.

ئەگەر ئەم سروشتەمان لەم سێ حاڵەتە پێکهێنا، دەگەینە ئەو ئەنجامەی بناغەی کە کاری ئەستۆ پرۆسەی خاڵیکردنەوەیە، چونکە دۆزی بناغەیی موسوڵمانە و تا لە حاڵەتی تەکلیفدا بێت ئەستۆی پڕ دەبێت و ئەمیش خاڵی دەکاتەوە، تا کۆتایی ژیانی. ئەمەش بەڵگەیە[1] لەسەر ئەوەی ئەستۆپاکی ویستراوە ویستراوە لە شەرعدا و بەدەستهێنانیشی پەیوەستە بەو شێوازی جێبەجێکردنەی داوا کراوە.

١- پەلەکردن لە راپەڕاندنی ئەوەی لە ئەستۆدایە و داوا کراوە لێی، ئەمیش شتێکی ویستراوە لە شەرعدا، چونکە فەرمان(الامر) لای زانایانی زانستی(اصول) خوازەی ڕاستەوخۆ(الفورية)یە و خوای گەورە فەرمانی کردووە بە پەلەکردن تێیدا، ئەمەش لەم فەرمایشتەی خوای گەرەوە تێ دەگەین: ﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٢١﴾ [سورة الحديد:٢١]، **هەروەها دەفەرموێت:** ﴿وَلِكُلّٖ وِجۡهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَاۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ أَيۡنَ مَا تَكُونُواْ يَأۡتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٤٨﴾ [سورة البقرة:١٤٨]. بنەڕەتیش ئەوەیە تەکلیف دروست نابێت تا بەڵگە لەسەر تەکلیفلێکراو نەچەسپێت، واتە (إقامة الحجة) نەکرێت. خودا دەفەرموێت: ﴿مَّنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا ١٥﴾ [سورة الإسراء:١٥]، **هەروەها دەفەرموێت:** ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبۡعَثَ فِيٓ أُمِّهَا رَسُولٗا يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِنَاۚ وَمَا كُنَّا مُهۡلِكِي ٱلۡقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهۡلُهَا ظَٰلِمُونَ ٥٩﴾ [سورة القصص:٥٩]. **ئەمەش**

[1] لێرە و لە سەرجەم ئەو شوێنانەی تری وەك ئەم شوێنە وان، ئەو وتەیەی نووسەر بە بەڵگە هێناویەتی، بە بەڵگە هەژمار ناکرێت، چونکە ڕێسایەکمان هەیە لای زانایان کە دەڵێت: "وتەی زانایان بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە، نەك بە بەڵگە بهێنرێتەوە."

مەبەستی یاسادانەرە لە یاسادانان و بەڵگەش دەچەسپێت دوای (گەیاندن) و (تێگەیاندن) و (توانین). گەیاندنیش بەوە دەبێت، کە تەکلیفلێکراو بزانێت دەربارەی پەیامەکە. تێگەیاندنیش واتە عاقڵ بێت و لە وتارەکە تێبگات. توانینیش ئەوەیە کە بتوانێت ئەرکەکان جێبەجێ بکات و گوێڕایەڵیی بکات. (ئیبن تەیمییە) دەڵێت: "ئەمەش بە دوو شت بەرپا دەبێت: مەرجی ئەوەی توانای زانینی هەبێت دەربارەی ئەوەی خودا ناردوویەتیە خوارەوە و توانای کارپێکردنیشی هەبێت[1]."

١- (ابن القیم) دەڵێت: "بەڵگەی خودا دەچەسپێت لەسەر بەندە بە ناردنی پێغەمبەر و ناردنە خوارەوەی کتێبەکەی و گەیشتنی ئەم دووانە بە بەندە و توانای زانینی، جا بزانێت یاخود نەزانێت. هەر کەس توانای زانینی فەرمان و ڕێگرییەکانی خودای هەبێت و کەمتەرخەمیی نواند یاخود نەیزانی، ئەوە بەڵگەی لەسەر چەسپاوە و خوداش ئەشکەنجەی کەس نادات، تا بەڵگەی لەسەر نەچەسپێت، هەروەك دەفەرموێت: ﴿مَّنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا ١٥﴾ [سورة الإسراء:١٥].

هەروەها دەفەرموێت: ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۖ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ ٨﴾ [سورة الملك:٨]. پاشان دانپێدانانی بەندە بە چەسپانی بەڵگەی خودا[2].

## مەبەستەکانی یاسادانەر لە یاسادانان

مەبەستی یاسادانەر لە یاسادانان، بریتییە لە (پاراستنی ئایین[1])، چونکە ئەو مەبەستی بنەڕەتیی بۆ شوێنکەوتووەکانی و جگە لەمیش مەبەستی دووەمین و شوێنکەوتووی ئەون، وەك ئەو نین و پێشی ناکەون.

---

[1] ابن تيمية، مجموع فتاوى شيخ الاسلام ابن تيمية، ج٢٠ ص٥٩.

[2] العلواني، مقاصد الشريعة، ص١٣٥. ومقال: التوحيد والتزكية والعمران.

(پاراستنی ئایین) مەبەستی یاسادانەرە لە یاسادانان و تاکە مەبەستێکە ئەوانی تر شوێنکەوتووی ئەون. مەبەستی بنەڕەت و جگە لەویش شوێنکەوتەی مەبەستی پاراستنی ئایینە، شتێکی تر وەك ئەو نییە و پێشیشی ناکەوێت.

پێنج گشتگیرەکە بریتین لە: پاراستنی ئایین و گیان و عەقڵ و وەچە و سامان[٢]. راجیایی هەیە لێرەدا لەسەر دابەشکردنیان وەك ئەوەی زۆرێك دابەشی دەکەن بەسەر پێنج پلەدا، ئەویش پێشخستنی ئایینە بەسەر گیان و نەفس بەسەر عەقڵ و عەقڵ بەسەر وەچە و وەچە بەسەر سامان، لەگەڵ بوونی راجیاییی نێوان زانایان لە پلەبەندیدا.




[١] ئەم خاڵەش دیسان پشتی بەستووە بە دابەشکردنی زانایانی پێشین، بێ گوێدان بەو گۆڕانکاری و خوێندنەوە نوێیانەی زانایانی هاوچەرخ کردوویانە بۆ زانستی مەبەستەکان. (وەرگێڕ)

[٢] ئەمە سەبارەت بە تاك، ئەی بۆ خێزان؟ ئەی بۆ نەتەوەی ئیسلامی؟ ئەی بۆ جیهان بەگشتی؟

دابەشکردنەکە لێرەدا جیاوازە لەو لایەنەوە کە کورتهەڵدێت تەنها لە دوو بەشدا، ئـــەوانیش: مەبەســـتێکی بنـــەڕەتی و شـــوێنکەوتوو، مەبەســـتانێکی دووەمـــی شوێنکەوتووی مەبەستی یەکـەم. مەبەسـتی بنـەڕەتی پاراسـتنی ئایینـە، مەبەسـتە دووەمییـەکان پاراسـتنی گیـان و پاراسـتنی عـەقڵ و پاراسـتنی وەچـە و پاراسـتنی سامان[1]. ئامانج لەمەش دووپاتکردنەوەی بنـەمای پاراسـتنی ئایینـە و هـەر ئـەویش لەپێشە و هیچ کات دوا ناخرێت لە هیچ کارێکدا.

بۆیە ئەو کەناڵانەی پاراستن کە هەن، بـریتیین لـە پاراسـتنی گیـان و پاراسـتنی عەقڵ و پاراستنی وەچە و پاراستنی سامان. جا زیاد بکرێت یاخود کەم، مرۆڤ هـەر کامیانی بوێـت پێشـی دەخـات، ئەگـەر نـەتوانرا یـەك بخـرێن. بـەپێی پلەبەندییـەك پاراستنی ئایین لەپێشینەیە، پاشان ئەوانی تـر و تێبینـیش دەکرێـت کـە پاراسـتنی ئایین بۆ مسوڵمان پێویستە لە هەموو بار و شوێن و کاتێك و لێی جودا نابێتـەوە تـا دەگاتەوە بـە خـودا، خـودا دەفـەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ [سورة الأنعام:١٦٢].

ئەم پلەبەندییە جووتـە لەگـەڵ ئەگـەری مەرجـدار لـە زمـانی بیرکاریـدا، ئـەویش ئەوەیە کە مەشروعیەتی پێشخستنی هەر مەبەستێك بەسەر ئـەوی تـردا، بەنـدە بـە پاراستنی ئایینەوە و نمایشکردنی ئەمە بیرکارییانە بەم هاوکێشەیە:

"ئەگەر (مەبەستە شوێنکەوتەکان –دووەمییەکان–| مەبەستی بنەڕەتی)"[2]

کە نیشانەی "|" واتە مەرجی جێبەجێکردنی پاراستنی ئایین، چونکە پاراسـتنی ئایین شوێنکەوتووە، بۆیە ئەو بنەمایە و سەرجەم مەبەستەکانی تـر شـوێنکەوتووی ئەون.

---

[1] الشاطبي، هەمان سەرچاوە. ٢/١٧ ـ ١٩ و٣/١٧١ و ٥/٣٥١.

[2] آل سعود، عبد العزيز بن سطام، ص٣٠٨.

لەبەر ئەوە پاراستنی ئایین رەچاو کراوە لە سەرجەم کارەکاندا و لەپێش هەموو شتێکەوەیە و جگە لەویش، پاش و پێش دەخرێت بەپێی پاش و پێش خستنی ئایین بۆی.

- پاراستنی گیان پێش دەخرێت بەسەر مەبەستە شوێنکەوتووەکانی تردا، ئەگەر ئەوە باشتر بوو بۆ پاراستنی ئایین.
- پاراستنی عەقڵ پێش دەخرێت بەسەر مەبەستە شوێنکەوتووەکانی تردا، ئەگەر ئەوە باشتر بوو بۆ پاراستنی ئایین.
- پاراستنی وەچە پێش دەخرێت بەسەر مەبەستە شوێنکەوتووەکانی تردا، ئەگەر ئەوە باشتر بوو بۆ پاراستنی ئایین.
- پاراستنی سامان پێش دەخرێت بەسەر مەبەستە شوێنکەوتووەکانی تردا، ئەگەر ئەوە باشتر بوو بۆ پاراستنی ئایین.

رەنگە بوترێت: لە کاتی تێکگیرانی پاراستنی عەقڵ لەگەڵ پاراستنی وەچە یاخود سامان یاخود گیان، ئەوە بەرزترینیان پێش دەخرێت بەسەر نزمتردا، ئەمە وەك دژایەتییە لەنێوان دوو شتدا، بێ پەیوەندیی راستەوخۆ بە پاراستنی ئایینەوە، واتە پەیوەندیی نێوان مەبەستەکان بەپێی ئەو پلەبەندییەی پێشتر، لەسەر پێ ناوەستێت.

وەڵامەکەی: دژایەتی نییە لەگەڵ ئەوەی هەمیشە ئایین پێش دەخرێت، چونکە بۆ وێنە: پاراستنی نەفس پێش دەخرێت بەسەر پاراستنی وەچە، ئەگەرچی عەقڵ بەڵگەیشە لەسەری، بەڵام مرۆڤ بە هۆیەوە تەکلیفی لەسەرە، بۆیە پاراستنی عەقڵ لە پاراستنی ئایینە، لەبەر ئەوە باشتر پیشاندانێك لەنێوانیان نییە کە ئەندێشەی مرۆڤ وێنای بکات، مەگەر ئەوەی خودا وەك بەندایەتی داوای لێ کردووین. پاراستنی

ئـاییینیش بـە زانـینی حـوکم و شـوێنکەوتنی دەبێـت و ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر پێشخستنی پاراستنی ئایین بەبەردەوامی، جا بە ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ.

جـا کاتێـك پاراسـتنی عـەقڵ پـێش دەخـەین بەسـەر پاراسـتنی وەچـە یـاخود بەپێچەوانەوە، ئەوە لەبەر ڕەچـاوکردنێك کـە ئـایین دەیخوازێـت، بۆیـە ئـەوەش لـە ڕەگەزی پاراستنی ئایینە.

لە نموونەکانی ئەوەش، لەناوبردنی نەفس لە تێکۆشان بۆ پاراستنی ئـایین، یـان وازهێنان لە فەرمانێکی ئایین بۆ پاراستنی گیان. ئەو وتەیەش کە دەڵێت یەکـەمیان بنچـینەیە و دووەمیـان هـەڵاوێردە، بـەڕەهایی نییـە، چـونکە هـەردووکیان لەسـەر بنچـینەن کـە پاراسـتنی ئایینـە. نموونـەی: دەربـڕینی وشـەی بێبـاوەڕی یـاخود هاوبەشدانان لە کاتی زۆرلێکردنێك کە سەر دەکێشێت بۆ کوشـتن، بـەڵام دڵ ئارامـە بە باوەڕ. ئەمەش لە ڕاستیدا بەفیڕۆدانی ئایین نییە، چـونکە ئـایین خـۆی فـەرمانی کردووە بە پاراستنی گیان بەم جۆرە، لەبەر ئەوەی دڵ مەرجە مادام دامـەزراو بێـت بە باوەڕ و ئەوەی لە رووکەشدا روو دەدات بـۆ دوورخسـتنەوەی زیانـە و هیچـی لـە دامەزراویی دڵ نەگۆڕیوە، بەم پێیەش لە بنەڕەتدا هیچێك لە ئایین بەفیڕۆ نـەدراوە. ئـایین بـەفیڕۆ نـەدراوە کاتێـك فەرمانبـەرداریی یاسـادانەر دەکرێـت و بـە مانـەوەی مسـوڵمان ئـایینیش دەمێنێتـەوە و بـەهێز دەبێـت بـە مانـەوەی شـوێنکەوتووانی. هەروەها پاراستنی عەقڵ پێش دەخرێت بەسەر پاراستنی نەفس و پاراستنی وەچـە پێش دەخرێت بەسەر پاراستنی سامان، ئەگەر هاتوو پاراستنی عەقڵ هۆکار بوو بـۆ زیاتر پاراستنی ئـایین. پاراسـتنی وەچـە پـێش دەخرێـت بەسـەر نـەفس و عـەقڵ و سـامان، ئەگـەر هـاتوو پێشخسـتنی وەچـە هۆکـار بـوو بـۆ زیـاتر پاراسـتنی ئـایین. هەروەها پاراستنی سامان پێش دەخرێت بەسەر پاراستنی عەقڵ و وەچەدا، ئەگـەر هـاتوو پێشخسـتنی سـامان هۆکـار بـوو بـۆ زیـاتر پاراسـتنی ئـایین، چـونکە ئـایین

هەمیشە پێش دەخرێت و گیان و عەقڵ و وەچە و سامان هەمیشە پاشتر دێن. لەبەر ئەوەی شوێن ئایین کەوتوون، ئایین بنچینەیە و ئەوانی تر لقن، لقیش هیچ کات پێش ناخرێت بەسەر بنچینەکەیدا و هەر لقێك پێش دەکەوێت بەسەر لقێکی ترد، بە ئەندازەی بەرزیی پلەکەی لە پاراستنی ئایین[1].

پوختەی قسان: پاراستنی ئایین بە چەند هۆکارێك دەبێت. هەریەك لە پێنج مەبەستەکان هۆکارێکە بۆ پاراستنی مەبەستەکانی تر، جا راستەوخۆ بێت، وەك ئەوەی پاراستنی گیان دەبێتە هۆی پاراستنی ئایین، یاخود لە رێی مەبەستێکی ترەوە، وەك ئەوەی پاراستنی نەفس پاراستنی عەقڵە و ئەویش ئایین دەپارێزێت. واتە هۆکاری جێگرەوەی زۆر هەن بۆ زنجیرەی پاراستنی هەر کام لە پێنج مەبەستەکان، بۆ وێنە: ژمارەی جێگرەوەکانی پەیدابوو لە ژمارە (پێنج)، بریتییە لە لێکدانی ژمارە (٥) یاخود (کارتێکەرانی ٥) ئەوانیش (٥*٤*٣*٢*١=١٢٠) رێگایە یاخود جێگرەوە.

بۆیە دەبێت رەچاوی پێشخستنی گشت بکرێت بەسەر بەشەکاندا، لە باری نەتوانینی کۆکردنەوەی هەموویان لە پاراستن و گەشەپێدانیان، ئەوا ئەوەیان زاڵ دەکرێت کە زۆرترین ژمارەی بەشەکانی پێ دەپارێزرێت بەسەر ئەوەیان کە کەمتر دەپارێزێت. لە باری نەتوانینی ئەوەش، ئەوا ئەو بەشەیان دەپارێزرێت کە زیاتر پێویستە و بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت تا هەردوو لا یەکسان دەبن، لەو کاتەدا ئیعتبارێکی تر زیاد دەکرێت، یان یەکلاکەرەوەیەکی نوێ بە درێژکردنەوەی مەبەستەکانی تر، تا لایەکیان زاڵ دەبێت بەسەر ئەوی تردا[2]، بە مەرجێك وێستگەی کۆتایی بریتی بێت لە پاراستنی ئایین هێندەی بتوانرێت.

---

[1] آل سعود، عبد العزیز بن سطام، ص٢٧ -٢٠٩.

[2] هەمان سەرچاوە.

## هێڵکاریی ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان




ڕەنگە گرنگترین بابەت کە هێڵکاریی ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان ئاماژەی بۆ دەکات، بریتی بێت لە چوونە ناو بەندایەتیی خوداوە وەك بژاردەیەکی خود، هەروەك چۆن بەندەی خوداین بەناچاری، بۆیە ئەمە پوختە و مەبەستی تەکلیف و ئیسلام و پەرستن و پاراستنی ئایین و گوێڕایەڵی و باوەڕە.

ڕاوەســـتانی مەبەســـتە دواکەوتووەکان(دووەمییـــەکان)، لەســـەر مەبەســـتە شوێنکەوتووەکان(یەکەمییەکان):

ئەگـەر بڕوانینـە پەیوەنـدیی نێـوان چەسـپاندنی بەڵگـە و ملکەچی(ئیسـلام) و پاراستنی ئایین، دەبینین پەیوەندیی نێـوان پاراسـتنی ئـایین و چەسـپاندنی بەڵگـە یەکسـان نـین، چـونکە ئـایین ناپاریزرێـت تـا بەڵگـە نەچەسـپێنرێت، بـەڵام ڕەنگـە بەڵگەش بچەسپێنرێت و ئـایینیش نـەپارێزرێت، چـونکە بەڵگـە لەسـەر بێبـاوەڕێکی توانادار دەچەسپێنرێت، کە موسوڵمان نییە تا ئایین بپارێزێت.

مرۆڤ بە ویستی خۆی بچێتە ژێر حوکمە شـەرعییەکان، ویسـتراوێکە چەسـپاندنی بەڵگـــەی بـــەدوادا دێـــت. ملکەچی(ئیســـلام)یش بـــەدوای چـــوونە ژێـــر حوکمـــە شەرعییەکانەوە دێت بە خۆویستی و دوای چەسپاندنی بەڵگـە. پاراسـتنی ئـایینیش بە گوێڕایەڵی و جێبەجێکردن دەبێت، دوای چوونە ناو ئیسلامەوە. هەموو ئەمانەش بەدوای ئەوەدا دێت، کە مرۆڤ بە ویستی خۆی بچێتە ژێر حوکمە شەرعییەکان.

١- وەستانی هەندێك مەبەست لەسەر هەندێکی تر، پێمان دەڵێت کە مەبەستە شەرعییەکان وەك زنجیرن، ئەڵقەی لێکئالاون بە جۆرێك یەکتر پتەو دەکەن. گرنگترین ئەڵقەی زنجیرەکەش بریتییە لە ئەڵقەی کۆتایی و ئەڵقەی یەکەم، واتا چوونە ژێر حوکمە شەرعییەکان بە خۆویستی و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی پلەی بەندایەتی تا دڵنیایی(مردن) دێت. خوا دەفەرموێت:﴿وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ٩٩﴾ [سورة الحجر:٩٩].

بەم پێیە، گرنگترینی ئـەوەی لـە ڕەهـای مەبەسـتە شـەرعییەکان وەردەگیرێـت، بریتییە لە هاوجووتبوونی ئەڵقەی یەکەم لە لێکئالـانی لەگـەڵ ئەڵقـەی کۆتـایی، بـۆ ئـــەوەی زنجیرەکـــە ببێتـــە بازنەیـــەکی بێکۆتـــایی، لەبـــەر ئـــەوەی گوێڕایـــەڵی و جێبەجێکردنی مەبەستەکانی هەریەك لە ئەڵقەکانی، یارمەتیدەرە بـۆ مەبەسـتەکانی

تر و هاوکاریی دەکات، ئەمەش واتە بەرزترین پلەی بەندایەتی کە ئەویش کاتێکە بواری ناچاریی بەندایەتی بە حوکمی بەدیهێنان، لەگەڵ بواری خۆویستیی بەندایەتی بە حوکمی بونەوەرەکان، هاوجووت دەبن.

## هێڵکاریی پلەبەندیی رەهای مەبەستە شەرعییەکان




پوختەی ئەم بەشە: بەرژەوەندییە پەسەندەکانی بەندەکان بە رەهایی، بواری هاوبەشی نێوان سەرجەم مەبەستە شەرعییەکانە، بۆیە هیچیان خاڵی نین لێی. خوداش پێغەمبەر و پەیامیان تەنها بۆ ئەوە رەوانە کردووە، بگات و لێی تێبگەین و مەبەستی توانای ئاسانکاریی هەبێت بۆیان لە چەسپاندنی بەڵگە لەسەریان و مەبەستی ئاشکراکردنی داواکراو لێیان بۆ ئاسانکاریی چوونە ناو بەندایەتیی خوداوە، خۆویستانە بێ خوبەزلزانی یاخود بەداخەوەبوون، یاخود بۆ بەندایەتی بە

ئاسانکاریی هەموو ئەو وتە و کردارە دیار و پەنهانانەی خودا خۆشی دەوێن، بۆ ئەوەی چرکەیەك لە ژیانیان بەفیڕۆ نەڕوات و هەموو ژیانیان ببێتە پەرستن و بەرژەوەندی لە یەك کاتدا و بۆ ئاسانکاریی پاراستنی ئایینەکەیان: ئیسلام کە ئاسایشیانە و بیروباوەڕیان باوەڕێك کە ئارامییانە و ئاسانکاریی کۆکردنەوە لەنێوان کرداری پەلەکان و کرداری دڵەکان، تا بەڵکو کردارەکانیان وەربگیرێت و بچنە ناو میهری خوداوە. هەموو ئەمانەش، مەبەست لێیان هەڵگرتنی بارگرانی و ئاسانکاری بۆیان، بۆ کارکردنیان، بۆ بەدیهێنانی رەهای بەرژەوەندیی بەندەکان لە هەردوو دنیادا.

# بەشی سێیەم

# مەبەستی شەرعیی رەها

روانـین لـە مەبەسـتی شـەرعیی ڕەهـادا، بـە پلـەی یەکـەم روانینـە لـە هۆکـاری هاوبەشی نێوان سـەرجەم مەبەسـتەکان، ئـەویش بەرژەوەندییـە، پاشـان بـە پلـەی دووەم روانینە لە جۆرایەتیی مەبەستە شەرعییەکان.

ئەگەر وتمان: مەبەستی شەرعیی رەها(المقصد الشـرعی المطلـق): ئـەو (الـف و لام)ەی سـەر وشـەی (المقصـد) واتـای گشـتگیری دەگەیـەنێت. ئەگـەر وشـەی (المطلق)یشمان بۆ زیاد کرد، ئەوە دووپاتی ئـەو گشـتگیرییەیە و بـە هـۆی ئـەوەوە گشتگیرییەکە تەواو بوو و سەرجەم تاکەکانی مەبەسـتەکان دەگرێتـەوە بـە جۆرێـك هەر مەبەستێك هەبێت، ئەوا دەچێتە ناویەوە و وەسفی دوای ئـەوە بـە رەهـا، واتـە هیچ سـنوورێك نامێنێـت بـۆ تایبـەتکردن لـە ئەگـەر و سـیفەت و جگـە لـەمانیش لـە پاشکۆکانی گشتگیری، کە ببێتە هۆی تایبەتکردن، بۆیە بەگشـتگیری دەمێنێتـەوە، لەبەر ئـەوە مەبەسـتی شـەرعیی رەهـا هـیچ تایبـەتکردنێك لەگـەڵ گشـتگیرییەکەیدا نییە، فەرمانی رەها، وەسفکردنی شتێکە بەڕەهایی، واتە ئـەوەی کـە ئـەو فەرمانـە

دەیگرێتەوە بێسنوور و ئەوەیە کە هاوتای (چی)یەتییە بێ هیچ مەرجێك، وەك زانایانی ژیربێژی دەڵێن، واتە چییەتی بەدەر لە هەر ڕێگرێك[1].

بەم پێیە، واتای مەبەستەکان بریتییە لە مەبەستی شەرعیی ڕەها، ئەویش (بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان)ە و ئەوەی ویستراوە بەبەردەوامی و هیچ فەرمانێکی شەرعی خاڵی نییە لێی.

زانایانی ئیسلام بە مەزهەبە جیاوازەکانەوە، کۆڕان لەسەر ئەوەی ئەحکامە شەرعییەکان مەبەست لێیان بەدیهێنانی بەرژەوەندیی بەندەکانە و بەسیشە بۆیان، جا ئەو بەرژەوەندییانە هی دنیا بێت یا دواڕۆژ، گرنگ بێت یاخود پێویست یاخود تەواوکاری. هەر کەس وای دانا یەکێك لە داکەوتەکان(وقائع)ی لەدەرەوەی ئەحکامەکانیەتی، بە جۆرێك پێویستی بە باش زانینی عەقڵ یا بە چاك زانینی خاوەن ئارەزووە لادەرەکان بێت لەگەڵیدا، ئەوە بە زمانی باری ڕووبەڕووی تەواوی ئایین و بەخششەکانی خودا وەستاوە کە لە قورئاندا هاتووە، کاتێك خودا دەفەرموێت: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣﴾ ﴾ [سورة المائدة:٣].

شەرعزانانی شوێنکەوتەی هەر چوار مەزهەبەکە و جگە لەوانیش، کۆڕان لەسەر ئەوەی هۆکار بۆ لێکدانەوەی حوکمە شەرعییەکان، بەندە بە بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی بەندەکان یاخود تەواوکردنیان، دوورخستنەوەی زیانەکان، یاخود کەمکردنەوەیان. ئەم کۆڕاییییەش زیاد لە زانایەك لە زانایانی بنەڕەت(اصول)، باسیان کردووە لە کاتی قسەکردنیان دەربارەی پێناسەی هۆکار(العلة) و شێوازی

---

[1] القرافي، الفروق، ج١ ص١٢٨. وحاسية ابن الشاط ص١٢٨ المتضمنة لحاشية ابن حسين المكي المالكي ص١٤٠.

سەلماندنی، لەوانەش (ابو الحسن الآمدي) کە دەڵێت: "حوکمەکانی خودا هۆکاریان بەرژەوەندیی بەندەکانە، چونکە کراون بە یاسا بۆ مەبەستی بەندەکان[1]."

(شێخ الإسلام ئیبن تەیمییە) دەڵێت: "خودا هەرچی بەدی هێناوە، دانایی(حیکمەت)ێکی تێدیە[2]. دانایی دوو شت لەخۆ دەگرێت: یەکەمیان: داناییەك کە دەگەڕێتەوە بۆ خودی خودا خۆی و خۆشی دەوێت و قایلە پێی. دووەمیان: تایبەتە بە بەندەکانی، ئەوەش نیعمەتێکە پێی دڵخۆش دەبن و چێژی لێ

---

[1] الآمدي، الإحكام في أصول الأحكام ج١ ص٥٤.

[2] بەکوردی و بە پوختی: جیاوازی نییە لە نێوان ئەو مەصڵەحەتەی پەیوەندی بە تەشریعەوە هەیە و ئەو مەسڵەحەتەی لە زانستی کەلامدا باسی لێوە کراوە، جیاوازییەکیش نییە لە نێوان حیکمەت لە بەدیهێنان و پێکهێنان و حیکمەت لە ئەمر و تەشریعدا. ابن القیم دەڵێت: خوای پەروەردگار دانایە و هیچ شتێکی بێهوودە یان بێ مانا و بێ مەیسەحەت و حیکمەت دروست ناکات و لە کارەکانیدا مەبەستی تەواوی هەیە. ئیبن تەیمییە دەڵێت: جومهوری ئەهلی سوننە و کەسانی تریش دەڵێن: خوای گەورە حەکیمە لە خەلق و لە ئەمردا و خەلق و ئەمری بێ حیکمەت نییە. ابن قیم الجوزیە داکۆکی لەسەر ئەوە دەکات کە کردار و فەرمانەکانی خوای گەورە بێ عیللەتی حیکمەتتدار و مەبەستدار نییە و ئەم راستییەش بەرزترین ئەو بابەتانەیە لە تەوحیدی پەروەردگاردا کە پەیوەندی بە خەلق و ئەمر و شەرع و قەدەرەوە هەیە. بڕوانە:

ـ ابن قيم الجوزية، شفاء العليل، ص١٩٠.

ـ مفتاح دار السعادة، ٤٠٩/٢.

ـ أصول الدين للبغدادي، ١٥٠ ـ ١٥١.

ـ مجموع فتاوى ابن تيمية، ٣٥/٨ ـ٣٦.

ـ بيان تلبيس الجهميةفي تاسيس بدعهم الكلامية، ابن تيمية، ١٩٧/١ ـ ٢٠٣.

ـ شرح العقيدة الاصفهانية، ابن تيمية، ص٢٦١ ــ ٢٦٣.

ـ منهاج السنة النبوية، ابن تيمية ١،١٤١.

ـ القضاء والقدر ٢٤٢ ـ ٢٤٨. وايضا موقف ابن تيمية من الاشاعرة ١٣١٠/٣ ـ ١٣١٢.(د. عبد الرحمن المحمود).

وەردەگــرن. ئەمــەش لــە فــەرمانپێکراوەکان و بەدیهێنراوەکانــدا[1]." ئەوەیشــی پاشــکۆیە بــۆی لــە شــێوەکانی بەڵگەهێنانەوە(اســتدلال) و مەنهەجــە راســت و پەسەندەکانی لای هەندێك لە زانایان وەك بەچاکزانین(الاستحســان) و راســتکردنەوە (الاستصلاح) و بونیادنانی حوکم لەسەر باو(عُرف).

بێگومان خودا هیچ بەرژەوەندییەکی نزیککەرەوەی لە بەهەشت جێ نەهێشتووە و هەمووی پێ وتووین و فەرمانیشی پێ کردووین، هیچ خراپەیەکی نزیککـەرەوە لـە دۆزەخیشی نەهێشتووە هەمووی پێ وتووین و قەدەغەیشی کـردووە لێمـان. (شـێخ الإسلام ئیبن تەیمییە ) لـەم راسـتییی ئاگـاداری کردووینــەوە لـەم بابەتـە و دەڵێـت: "وتەی کۆکـەرەوە ئەوەیـە شـەریعەی ئیسـلامی هـەرگیز بەرژەوەنـدی وەلا نانێـت، بەڵکو خودا ئایینی بۆ تەواو کردووین و نیعمەتەکانیشی بۆ تەواو کردووین. بۆیە هیچ شتێکی نزیککەرەوە نییە لە بەهەشت کـە پێغەمبـەر(درووودی خـودای لەسـەر) پێـی ڕانەگەیاندبێن و جێی هێشتووین لەسەر بەڵگەیـەکی بـێ خـەوش، شـەوی وەك رۆژی رووناکە و تەنها فەوتاوەکان لێی لا دەدەن[2]."

هەروەها (عیززی کوڕی عبد السلام) کاتێك دەڵێت: "خودا پێغەمبەرانی نـاردووە و کتێبەکانی ناردووەتە خوارەوە، بۆ بەرپاکردنی بەرژەوەندییەکانی دنیا و دواڕۆژ و دوورخستنەوەی خراپەکانی[3]."

رەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانیش لەلایەن یاسادانەرەوە لە حوکمە لاوەکییـەکان (الجزئیـات)، تایبـەت نییـە بـەو حوکمانـە خۆیانـەوە، بـەڵکو گشـتییە لـە بنـەڕەتی

---

[1] مجموع فتاوى ابن تيمية ٣٥/٨ ـ٣٦.

[2] هەمان سەرچاوە ٣٤٤/١١.

[3] ابن عبد السلام، عبـد العزيـز، مختصـر الفوائـد في احكـام المقاصـد، تحقيـق: صـالح بـن عبـد العزيـز آل منصور، ط١ الرياض، دار الفرقان، ١٤١٧هـ ١٩٩٧مـ ص١٧.

یاسـادانان و تەکلیفـدا. یاسـادانەر ڕەچـاوی (بەرژەوەنـدیی ڕەهـای بەنـدەکان)ی کردووە لە بنەڕەتی یاسـادانان، لـەو ڕووەی تـەواوی کـردووە و ڕەهـای کـردووە لـە سەرجەم شوێنەکانی، ڕەچاوی ڕەهای کردووە لە هەندێك شوێن و تـەواوی کـردووە لـە هەنـدێکی تـر لـە بنـەڕەتی تەکلیفـدا بـە مەبەسـتی ئاسـانکاری، بۆیـە داوای لـێ نەکردوون زیاد لەوەی ڕێکیان دەکاتەوە و باریان ڕێکوپێك دەکات[1].

لەو لایەنەوە کە شەریعە لە بنـەڕەتی دانـانی شـەرعدا بریتییـە لـە بەرژەوەنـدیی بەنـدەکان. تـەواوکردنی بەرژەوەنـدیی ڕەهـای بەنـدەکان لـە لایـەنی بنـەڕەتی تەکلیفەوە، بونیاد نراوە لەسەر ئاسانکاری و نەخستنە ئەستۆیان، تاوانی شتێك کە لە تواناییانـدا نییـە. پێغەمبـەر(درودی خـوای لەسـەر بێـت) دەفـەرموێت: "ئـەوەی قەدەغەم کرد لێتان، دوور بکەونەوە لێی، ئەوەی فەرمانیشم پێ کـردن، جێبـەجێی بکەن بەپێی تواناتان، ئەوەی گەلانی پێش ئێوەی لەناو برد، زۆری پرسـیاریان بـوو و لەگەڵ ڕاجیاییان لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان[2]."

دەقەکانی قورئان، فەرمایشتەکانی پێغەمبـەر کـە حوکمـەکانی چەسـپاندووە لـە فـەرمان و قەدەغـەکردن، دانـایی و بەرژەوەندییـەکانی بۆیـان دانـراون، ئاشـکرا کردووە. بۆیە فەرمانی کردووە بەوانەی لە جیبێـەجێکردنیان بەرژەوەنـدی بەدەسـت دێت و قەدەغەی ئەو کردارانەی کردووە کـە خراپـەی لەگەڵدا دێت. ئەمـەش واتـە:

---

[1] الطوفي، كتاب التعيين في شرح الاربعين، تحقيق: أحمد حاج محمد عثمـان،ط١ بـيروت، مؤسسـة الريـان، ١٤١٩هـ ـ ١٩٩٨م.ص٢٤٣.

[2] اخرجه البخاري، الجامع الصحيح (٧٢٨٨/٩٤/٩) ومسلم في الصحيح، تحقيق: محمـد فـؤاد عبـد البـاقي، ط١، ١٤١٢هـ دار الكتب العلمية، ١٨٣٠/٤رقم١٣٣٧. من حديث ابي هريرة.

"بەرژەوەندی دەبێت رەچاو بکرێت و خراپەش دەبێت دوور بخرێتەوە، چونکە حوکمەکان بۆ ئەوە دانراون[1]."

شوێنکەوتووی وتە و بەڵگەی زانایان بۆی دەردەکەوێت کۆڕان لەسەر ئەوەی کە: شەریعەی ئیسلامی رەچاوی بەرژەوەندیی کردووە لە حوکمەکانیدا، چونکە حوکمەکانی خودا لێك دەدرێنەوە بە رەچاوکردنی بەرژەوەندییەکان وەك نیعمەت و بەخششێك بۆ بەندەکان، واتە چاودێریی خودا بۆ بەرژەوەندیی بەندەکان وەك بەخشش و سۆزێك.

(ابن القیم) دەڵێت: "بنەما و بنەڕەتی شەریعە لەسەر دانایی و بەرژەوەندیی بەندەکانە لە دنیا و دواڕۆژدا. شەریعە هەمووی دادگەرییە، هەمووی سۆزە، هەمووی بەرژەوەندییە و هەمووی داناییيە. بۆیە هەر بابەتێك دەرچوو لە دادگەرییەوە بۆ ستەم و لە سۆزەوە بۆ دژەکەی، لە بەرژەوەندییەوە بۆ خراپە، لە داناییيەوە بۆ گاڵتەجاڕی، ئەوە لە شەریعەدا نییە، گەر چی بەتەئویلیش خرایە ناویەوە[2]."

مەبەست بە واتای ئامانجە: هەندێك جار وشەی (المقصد) واتای (ئامانجێکی خوازراو) دەدات، بۆیە دەوترێت: (مقصد القول) واتاکەشی بریتییە لە: "ئەو ئامانجەی قسەکەر مەبەستیەتی لە قسەکەی و دەیەوێت بەدەستی بێنێت." واتە ئەو بەهایەی کە لە قسەدا مەبەستە و رێنمونی دەکات، بۆیە واتای مەبەست دەبێتە ئەو ناوەرۆکە بەهاییيەی کە قسەکەر لە کات یاخود شوێنی قسەکردندا

---

[1] اللخمي، رمضان عبد الودود، التعليل بالمصلحة عند الأصوليين، ط ١ القاهرة، دار الهدى للطباعة، ١٤٠٧هـ ـ ١٩٨٧م. ص٢٢ ـ ٢٥.

[2] ابن قيم الجوزية، اعلام الموقعين عن رب العالمين، ط ١ بيروت، المكتبة العصرية، ١٤٠٧هـ ١٩٨٧م ٣/٦ـ٧.

مەبەستیەتی، ئەگەر قسەش ئەمەی تێدا نەبوو ئەوا دەبێتە گاڵتەجاڕی[1]، زانایانی بنەڕەت(اصول) ئەم واتایەی سێیەمی مەبەستیان دەربڕیوە بە وشەی بەرژەوەندی، چونکە بەها و بەرژەوەندی دوو ناون بۆ یەك ناوەڕۆك، ئەویش ئەوەیە کە باری مرۆڤی پێ ڕێك دەبێت[2]. (الشاطبي) دەڵێت: "شەرع ئەوەی ئاشکرا کردووە کە باری مرۆڤی پێ ڕێك دەبێت لە دنیا و دواڕۆژ، بە باشترین و تەواوترین شێوە[3]." (الطاهر بن عاشور) دەڵێت: "ئێمە دڵنیاین حوکمەکانی شەریعە سەرجەمیان مەبەستەکان لەخۆ دەگرن و هەمووشی دانایی و بەرژەوەندییە[4]."

## مەبەست لە مەبەستی شەرعیی ڕەها

مەبەست لە مەبەستی شەرعیی ڕەها، بریتییە لە پاراستنی ڕەهای بەرژەوەندیی بەندەکان.

مەبەستی شەرعیی ڕەها، مەبەستی (ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان)ە و بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان، مەبەستی (مەبەستی شەرعیی ڕەهایە)، بەم پێیەش بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان، بنەڕەتی سەرجەم بەرژەوەندییە بڵاوەکانە لە ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان کە خودا داینـاوە لە سەرجەم حوکمە شەرعییەکاندا.

---

[1] شاتیبی بابەتی مەقاصیدی بە واتا تایبەتترەکەی باس کردووە، واتە ئامانجەکان لە جۆری یەکەمدا و لە بەشی یەکەمی پەرتووکی مەقاصیددا بە ناونیشانی(مقاصد وضع الشريعة ابتداء).

[2] کاتێك زانایانی ئوصول جەمعی(المقاصد)بەکاردەهێنن بۆ ئەم سێ واتایە: المقصود، المقصودات، المقاصد، بە واتای (القيم) ئەوە لە بابەتی (تەغلیبە)، چونکە وشەی(المقصود) بە (مقاصيد) دەکرێتە جەمع نەك مقاصد.

[3] الشاطبي، الموافقات، ١٤١٧هـ ـ ١٩٩٧م ص٥٣/١.

[4] ابن عاشور، مقاصد الشريعة الإسلامية ص٤٨.

پاراستنی مەبەستی شەرعیی ڕەها، بنەڕەتی پاراستنی ڕەهای مەبەستە شەرعییەکانە. بۆ ئەمەش پاراستنی بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان، بنەڕەتی پاراستنی ڕەهای بەرژەوەندیی بەندەکانە کە لە حوکمە شەرعییەکاندایە. بەم پێیەش مەبەستی (مەبەستی شەرعیی ڕەها)، بریتییە لە پاراستنی بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان و لە سەرەتاشیەوە پاراستنی ڕەگەزیانە، پاشان جۆرەکەی و بڕەکەی لە لایەنی هێنانە دی ئەوەی هۆکارە بۆ ئەمە و دوورخستنەوەی ئەوەی خراپی دەکات.

شاراوە نییە لای خاوەن عەقڵەکان، کە بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی ڕووت و دوورخستنەوەی خراپەی ڕووت، ستایشکراو و چاکە، پێشخستنی ئەو شتانەی بەرژەوەندی تیایاندا زیاترە و دوورخستنەوەی ئەو شتانەی زۆرینەیان خراپەیە، تا دەگاتە ئەوەی چاکەکەی زیاترە لە خراپەکەی، ئەمانە شتانێکی چاکن، هەروەها دوورخستنەوەی ئەو شتانەی خراپەیان ئاشکرایە و زیاترە لە بەرژەوەندی تیایدا، زانایان و دانایان کۆڕان لەسەری و هەروەها یاساکانیش[1].

جیاکاری لەنێوان زۆر و کەم، مەبەست لێی بەدەستهێنانی زۆرە و وازهێنانە لە کەم. بۆیە لەدەستنەدان، مەبەست لێی زۆرکردنە و بۆ بەگەڕخستنی ڕێکاریی لەدەستنەدانی بەرژەوەندی بۆ بەرژەوەندییەکی باشتر لە ئەرکدا، ئەویش ڕێگرتنە لە کەمکردنەوەی سوود و خواستنی زۆرکردنیەتی، ئەمەش ئەوە دەخوازێت کە بەدەستهێنانی سوودەکان بە جۆرێک بێت، ببێتە هۆی زیادکردنی و قسەکەی

[1] اللخمي، هەمان سەرچاوە. لا٥٤

(التفتازانی)ش ئـەوە مەبەسـتیەتی کـە دەڵێـت: "زۆرکردنـی سـوود بـە جۆرێك کـە زۆرینەی گومان وا بێت بەرەو ئەوە دەچێن[1]."

ئەمەش واتە بنەڕەتی بەرژەوەندی ئەوەیە کە زۆرترین سوود و فەزڵی هەیە، هەروەك وا دەخوازێت کە پەیوەندییەکی راستەوانە هەبێت لەنێوان بەرژەوەندی و خواستی زۆرکردنی و رێگری لە کەمکردنەوەی، چونکە بەرژەوەندی لە خولگەی چاکتریندایە و خواستی چاکترینیش لەو خەسڵەتانەیە کە خودا بە باشە باسی ئەو بەندە باوەڕدارانەی کردووە کە هەڵگرین، بۆیە فەرمووی: ﴿ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٨﴾ [سورة الزمر:١٨].

(شێخ الإسـلام ئـیبن تەیمییـە) دەڵێـت: "واجبـە لـە بیروبـاوەڕدا شـوێنکەوتەی باشترین را بیت، کەس بۆی نییە باوەڕی بە شتێك بێـت و وا بزانێـت بەرامبەرەکـەی باشترە لەو، کاتێك دوو بژاردە خرایە بەر دەستی و ئەویش بڕوای وا بێت یـەکێکیان باشترە، کەواتە ئەوەیان باشترە، ئەگەر دروسـتیش بـوو ئـەوەیان بکـات کـە باشـە بەڵام باشتر نییە ــ کاتێ نەتوانێت باشترەکە بکات ــ ئەوە دەبێت بڕوای وا بێت کـە ئەوە باشترە و حەزیشی لە ئەنجامدانی ئەوەیان زیاتر بێـت، ئـەوەش شـوێنکەوتنی باشترینە[2]". کەواتە ئەوەی پێویستە(واجبە) لە کرداردا ئەوەیە: بـاوەڕی وابێـت کـە ئـەوەی باشـترینە و ناتوانرێـت ئـەنجام بـدرێت، باشـترە لـەوەی پلـەی باشـییەکەی نزمترە لـە باشـترین و دەتوانرێـت ئـەنجام بـدرێت، ئەگەرچـی دروستیشـە بـۆی کـە دووەمیـان ئـەنجام بـدات. پاشـان ئـەرکی زیـادکردن بریتییـە لـە بەدەسـتهێنانی

---

[1] التفتازاني، سعد الدين بن مسعود، التلويح شرح التوضيح في كشف حقائق التنقيح، تعليق محمد عدنان، ط ١، بيروت، دار الارقم، ١٤١٨هـ ١٩٩٨م، ص٢٧١.

[2] مجموع فتاوى ابن تيمية، ٢٧٠/١٩.

سەرجەمی ئەوەی لە توانادایە، بە جۆرێك ئـەوەی کـە دەمێنێتـەوە ئەوەیـە کـە لـە توانادا نییە بەدەست بهێنرێت و ئەوەش داوای کردنی ناکرێت، چونکە خوای گەورە دەفـــەرموێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ﴾ [سورة البقرة:٢٨٦]. پێغەمبـــەریش دەفەرموێت: "اذا امرتكم بامر فأتوا منه ما استطعتم[1]."

بەم پێیە مەبەست لە بەرژەوەنـدیی رەهـای بەنـدەکان، بریتییـە لـە: چـاودێریی بەرژەوەنـــدییان و زیـــادکردنی و دوورخســـتنەوەی خراپـــە و کەمکردنـــەوەی. بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی بەندەکان لە دنیادا لەسەر چەند ئاستێك دێـت، بـەپێی ئاسانکاریی خودا بۆیان و پاشان هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان لە بەردەوامیی کارکردن و مرۆڤەکانیش لەوەدا لە پلەی جیاوازدان، هەیانـە زیـاد دەکـات و هەشـیانە کـەم و هەشیانە مامناوەند و هەشیانە لەخوارترەوەیە.

**زانستی مەبەستەکان و بابـەتی سـوود:** پـاش ئـەم رێخۆشـکردنە بـۆ بابەتەکـە، دەمـەوێت ئـەوە بڵـێم کـە (د.طـە عبـد الـرحمن) تێبینیـی هەیـە لەسـەر پێناسـەی زانســـتیی مەبەســـتەکانی شـــەریعە، بـــەوەی کـــە زانســـتێکە دەڕوانێتـــە ئـــەو بەرژەوەندییانـــەی شـــەریعەی لەســـەر بونیـــاد نـــراوە و دەڵێـــت: "ئـــەم پێناســـەیە، ئەگەرچی ناسێنەری تێدا زیاتر ئاشکرا کراوە لە ناسێنراو، بـەڵام گرفتێکـی تێدایـە، ئـــەویش ئەوەیـــە کـــە ئـــەو ئاشـــکراکردنە پەیوەســـتە بـــە ئاشـــکراکردنی چـــەمکی (بەرژەوەنـــدی) و ئـــەویش چـــەمکێکە ئاڵۆزییـــەکی زۆر رووی تـــێ کـــردووە و ئـــەو ئاڵۆزییەش لە دوو شتەوەیە:

- یەکێکیان: داڕشتنی پێکهاتەکەیەتی، بە جۆرێك ئەو پێکهاتەیە —لـە زمـانی عەرەبی(وەرگێڕ)— لەسەر کێشێکە کە ئاماژەیە بۆ ناوی شوێن، بۆیە بیری مرۆڤیش دەچێت بۆ ئەوەی ئەمە ناوی شتێکی لایەنگیرە، هـەروەك وتـەی زانایـانی ئوصـولی

[1] اخرجه البخاري، ١٤٢/٨.

فیقهـی ئیسـلامی (الأصـولیون) وا دەگەیـەنێت: (راکێشـانی بەرژەوەنـدی) یـاخود (چاودێریی بەرژەوەندی).

- دووەمیشیان: فراوانیی واتاکەی لای زانایانی پاشـین، تـا بەرژەوەنـدی لای ئەوان وای لـێ هـاتووە کـە هاوواتـای ئامانجـە(الغـرض)، وەك لـە وتـەیان: (تحقیـق المصلحة العامة) یاخود (طلب المصلحة الخاصة)[١]."

بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "لـە راسـتیدا بەرژەوەنـدی نـاوێکی لایـەنگیر نییـە، بـەڵکو نـاوی واتایـەکی رووتـە، بۆیـە دەبێتـە هاوواتـای چـەمکی (سـوود) لـە واتـا دارشـتنییە چـاوگییەکەیدا، ئەگـەر وتـرا: 'زانسـتی مەبەسـتەکان دەروانێتـە بەرژەوەندییە دنیایی و دوارۆژییەکانی مرۆڤ.' ئەوە مەبەست لەوەیە کـە دەروانێتـە لایەنەکانی سـوودگەیاندن بـە مـرۆڤ لـە دنیـا و دوارۆژدا. هـەروەها مەبەسـت ئامـانج نییە، بەڵکو رێبازە، ئەگەر وترا: 'زانستی مەبەستەکان دەروانێتە بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ.' ئەوە مەبەست لەوەیە کە دەروانێتە ئەو رێبازانەی مرۆڤی پـێ چـاك دەبێـت، بۆ بەدیهێنانی سیفەتی بەندایەتی بۆ خودا[٢]."

لە راستیدا ئەگەرچی قسەکانی بەدەر نین لە راستی، بەڵام گرفتەکەی چارەسـەر نـەکردووە کـە بریتییـە لـە دیـاریکردنی پەیوەنـدیی نێـوان مەبەسـتەکان و بەرژەوەندییەکان لە لایەك و لەنێوان بەرژەوەندییەکان و سوود لە لایەکەی تر.

هۆکارەکەشـی جیاوازینەکردنـە لـەنێوان مەبەسـتی مەبەسـتەکان، کـە پێشـتر باسمـان کـرد و بریتییـە لـە بەدەسـتهێنانی بەرژەوەنـدی و زیـادکردنی و دوورخستنەوەی خراپە و کەمکردنەوەی و لـەنێوان مەبەسـت لـە مەبەسـتەکان، کـە

---

[١] عبد الرحمن طه، مشروع تجدید علمي لمبحث مقاصد الشریعة، مجلة المسلم المعاصر، عدد١٠٣، ١٤٢٢هـ ٢٠٠٢م، ص٤٩ ـ ٥٠.

[٢] سەرچاوەی پێشوو.

ئەویش وەك (د.طه عبد الرحمن) لێی نزیك بووەتـەوە، کـە دەڵێـت: "مەبەسـت لـەو ڕێبازانەی مرۆڤی پێ چاك دەبێت، بۆ بـەدیهێنانی سـیفەتی بەندایـەتی بـۆ خـودا." ڕەنگە پێکانیش لەوەدا بێت کـە بەرژەوەنـدیی بـەدیهێنانی سـیفەتی بەندایەتییـە و ئەویش سوودی ڕەهای بەندەکانە، وەك لە داهاتوودا ئاشکرای دەکەین.

## مەبەست لە مەبەستی شەرعیی ڕەها

پێشتر ئەوەمان کردەوە کە مەبەستی شەرعیی ڕەها، بریتییە لە "بەرژەوەنـدیی ڕەهای بەندەکان" ئەمەش ویستراوە بەردەوام لە هەر مەبەستێکی شەرعیدا و خاڵی نییە لێی، مەبەست لەمیش بریتییە لە: پاراستنی ڕەهای بەرژەوەندی بـە چـاودێری و زیادکردنی بەرژەوەندییەکان و دوورخستنەوە و کەمکردنەوەی خراپەکان.

زانینی ئامـانج لـە مەبەسـتی شـەرعیی ڕەهـا لـە زانـینی وەڵـامی پرسـیارێکدایە: بۆچـی خـودا بەرژەوەنـدیی بەنـدەکانی کردووەتـە مەبەسـتی شـەرعیی ڕەهـا؟ وەڵامەکەشـی: وەك پێشـتر ئاشـکرا کـرا ئەوەیـە، خـودا بێنیـازە لـە پەرسـتنی بەنـدەکانی بـۆی و تـەنها بەخشـش و ڕێزێکـە لەلایـەن خـوداوە بـۆ ئـەوان و هـیچ پێویستییەکی پێی نییە.

بەم پێیە ویستراوی مەبەستی شەرعیی ڕەها بریتییە لە: سوودی بەنـدەکان وەك بەخشـش و ڕێـز، هـەر وەك خـودا پێویسـتی کـردووە لەسـەر خـۆی، چـونکە هـیچ بەدیهێنراوێك ناتوانێت زۆری لێ بکات[1].

---

[1] مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەت (سەلەف) لەسەر ئەوەیە کە عەقڵ ناتوانێـت هـیچ شـتێك لەسـەر خودا واجب نییە، بەڵام کێشەیەك نییە کە خودا خۆی بەپێی کـەمالی خـۆی شـتێك لەسـەر خـۆی واجـب بکات، کاتێك خۆی فەرموویەتی لەسەر خۆم واجب کردووە، ئەمەش لە قورئان و فەرموودەی صـەحیحدا هەیە. بڕوانە: ــ الطوفي، كتاب التعيين في شرح الاربعين، ص٢٤٢.

١- **ویستراوی مەبەستی شەرعیی رەها، ویستراوی بەرژەوەندیی رەهای بەندەکانە و زانینی مەبەستی خوداش تێیاندا، وەستاوە لە سەر زانینی بێنیازیی خودا بۆ بەدیهێنراوەکانی، چونکە یەکێك لە ناوەکانی خودا کە لە قورئاندا هاتووە، (بێنیاز/الغني)ە. هەندێك دەڵێن (بێنیان) لە قورئاندا لە هەژدە شوێندا هاتووە، خودا دەفەرموێت:** ﴿قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَـٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ۖ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَـٰنٍۭ بِهَـٰذَآ ۚ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾﴾ [سورة يونس:٦٨]، **هەروەها دەفەرموێت:** ﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكْفُرُوٓا۟ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾﴾ [سورة إبراهيم:٨].

**(الغنيّ) لە زمانی عەرەبیدا ئەوەیە کە پێویستی بە جگە لە خۆی نییە، (الخطابي) دەڵێت: "ئەو کەسەیە کە بێنیازە لە بەدیهێنراوەکانی و سەرخستنی ئەوان بۆی و پشگیریکردنیان لە دەسەڵاتی، چونکە هیچ پێویستییەکی پێیان نییە و ئەوانیش هەژارن و پێویستیان بەوە، هەروەك وەسفی خۆی دەکات[1]:** ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾﴾ [سورة فاطر:١٥]، **بۆیە خودا بێنیازە لە سوودگەیاندنی خەڵکی پێی و لەوەیش بەرژەوەندیی ئایین بگەڕێتەوە بۆ ئەو.**

**خودا خۆی بێنیازە بۆ خۆی، کە بێنیازییەکی تەواوە لە سەرجەم رووەکانەوە، بە هۆیی کامڵیی خۆی و سیفاتەکانی، چونکە خەزێنەکانی ئاسمان و زەوی و**

---

ـ ابن تيمية، اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة اهل الجحيم، تحيقي وتعليق: ناصر بن عبد الكريم العقل، ط ١، الرياض، دار الرشد، ص٤٠٩ ـ٤١٠.

[1] حمد محمد الخطابي أبو سليمان، شأن الدعاء تحقيق: أحمد يوسف الدقاق، دار الثقافة العربية، ط٣، ١٤١٢هـ ١٩٩٢م، ص٩٢ ـ٩٥..وانظر: امين الشقاوي، ٣١٠٥٨، www.alukah.net/sharia. ‎.PM> 14 May١٢:٤٦

خەزێنەكانی دونیا و دواڕۆژیش بە دەست خۆیەتی، بۆیە خـودا بـۆ خـۆی بێنیـازە و بەندەیش بۆ خۆی هەژارە و پێویستی بە خودایە، و ناتوانێت بـۆ چـاوتروكانێكیش بێنیـاز بێـت لێـی، تـەواوترینی بـەدیهێنراوەكانی خـودا ئەوەیانـە كـە تـەواوترین بەندایەتی دەكـات و گـەورترینیان ئەوەیانـە كـە هـەژاری و پێویسـتی بـە خودایـە و بێنیـاز نـەبێت لێـی هێنـدەی چـاوتروكانێك، بۆیـە یـەكێك لـە دوعاكـانی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێت) بریتی بووە لە: "سـەرجەم كاروبارەكـانم بـۆ چاك بكە و جێم مەهێڵە بۆ خۆم هێندەی گەر هێندەی چاوتروكانێكیش بێت[١]."

خوداش بێنیازە و خاوەنی ئاسمانەكان و زەوییە، خودا دەفەرموێت: ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ٦٤﴾ [سورة الحج:٦٤]، هەروەها ئیمامی (موسلیم) گێڕاویەتیەوە، لە فەرموودەكەی (ئەبو ذەر)دا كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: "خودا فەرمووی: 'ئەی بەندەكانم، ئێوە ناگەنە ئەوەی زیان بە من بگەیەنن تا زیانم پێبگەیەنن و ناگەنە ئەوەی سوود بە من بگەیەنن تا سوودم پیّ بگەیەنن. ئەی بەندەكانم، ئەگەر یەكەمتان و كۆتاكەستان لە مرۆڤ و پەریتان، لەسەر دڵی پاكترین و پارێزكارترینتان بن، ئەوە هیچ لە موڵكی من زیاد ناكات. ئەی بەندەكانم، ئەگەر یەكەمتان و كۆتاتان

---

[١] ئەم دوعایە بەشێكە لە فەرموودەیەك كە ئیمامی أحمد لە (المسند)دا ریوایەتی كردووە، تحقیق: شعیب الارنـاؤو ط١، ١٤٢٠هــ بـیروت، مؤسسـة الرسـالة، (٣٤/٧٤ ـ ٧٥ رقـم٢٠٤٣٠). وە: أبـو داود في السـنن، تحقیق: محمد محي الدین عبد الحمید، طبعة: بـدون، صـیدا، المكتبـة العصـریة، ٤/ ٣٢٤/ رقـم ٥٠٩٠. وە: النسائي في السنن الكبری، حسن عبد المـنعم الشـلبي، ط١، ١٤٢١هــ . بـیروت، مؤسسـة الرسـالة(٢١١/٩ ـ ٢١٢)رقم١٠٣٣٠. لە سەنەدەكەیدا جعفر بن میمون هەیە و نەسائی دەڵێت: بەهێز نییە. بەڵام نەسائی ئەم دوعای لەپێشەوە راستەوخۆ هێناوە (٢١١/٩ ـ٢١٢ رقم ١٠٣٣٠)لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە و ئـەلبانی لـە سیلسیلە صەحیحەكەیدا بە حەسەنی داناوە، ٤٩٩/١ رقم ٢٢٧.

و مرۆڤ و پەریتان، لەسەر دڵی خراپترینتان بن، ئەوە هیچ لە موڵکی من کەم ناکات[1]."'

بۆیە سەرجەم بەدیهێنراوەکان، هەژاری لای خودای بێنیازی فراوانن، لە داواکردنی بەرژەوەندییەکانیان و دوورخستنەوەی زیانەکان، هەروەها لە کاروباری ئایین و ژیانیان و بەندەکان هیچیان بەدەست نییە لەوانە بۆ خۆیان. خودا دەفەرموێت: ﴿مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝٢﴾ [سورة فاطر:٢]، بۆیە خودا بێنیازێکە کە خواردن و خواردنەوە دەبەخشێت، و دەژیەنێت و دەمرێنێت، دەوڵەمەند دەکات و هەژار دەکات، خودا لەبارەی ئیبراهیمەوە دەفەرموێت: "قال افرايتم ما كنتم تعبدون، انتم و آباؤكم الاقدمون، فانهم عدو لي الا رب العالمين، الذي خلقني فهو يهدين" (الشعراء : ٧٥–٧٨).

بەکورتی، سەرجەم بەدیهێنراوەکان پێویستیان بە خودایە لە بوونیان، چونکە بوونیان بە ئەوەوەیە، پێویستیان پێیەتی بۆ وەستانیان و وەستانیان بە ئەوەوەیە، هیچ جووڵە و راوەستانێکیان نییە ئەگەر ئەو رێگە نەدات، چونکە ئەو زیندوو و راگرە (الحيّ القيوم) بۆ خۆی و پێویستی بە هیچ شتێك نییە و راگری جگە لە خۆیەتی، هیچ شتێك راوەستاو نییە بەو نەبێت، چونکە بەدیهێنەر بێنیازی و تەواویی رەهای هەیە و بەدیهێنراویش پێویستی رەهای بە خودا و تەواوییەکەیەتی.

خودا بە هۆی تەواو بێنیازیی لە بەدیهێنراوەکانی، دەتوانێت مرۆڤەکان لەناو ببات و بەدیهێنراوێکی نوێ بێنێتە بوون، ئەمەش لەدەرەوەی توانای خودا نییە. خودا دەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ ٱلْغَنِىُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ

---

[1] رواه مسلم ١٩٤٤/٤ رقم ٢٥٧٧.

وَيَسۡتَخۡلِفۡ مِنۢ بَعۡدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوۡمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾ [سورة الأنعام:١٣٣]. **بۆیە بەخششی خودا بۆ سوودی مرۆڤەکان بەرەهایی، بریتییە لە ویستراوی مەبەستی شەرعیی ڕەها و ئەم بەخششەش خودا لەسەر خۆی پێویست کردووە و هیچ یەکێك لە بەدیهێنراوەکان ناتوانێت ناچاری بکات[1]. هەر ئەوەش ویستراوی بەرژەوەندیی رەهایە، چونکە سوودبەخشینی خودا بۆ بەندەکان بەخششە، خودا دەفەرموێت:** ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ [سورة النور:١٠]، **بەندەکانیش شایستەی بوون بە هۆی یەکخواپەرستییان و هاوبەشدانەنانیان بۆ خودا، خودا دەفەرموێت:** ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾﴾ [سورة النور:١٤]. **هەروەها لە (معاذی کوڕی جبل) دەگێڕنەوە دەڵێت: "لە پشتی پێغەمبەری خوداوە بووم، لە سواری گوێدرێژێك و فەرمووی: 'يا معاذ هل تدري ما حق الله على عباده، و ما حق العباد على الله؟ فقلت: الله و رسوله اعلم، قال: حق الله على عباده ان يعبدوه و لا يشركوا به شيئا، و حق العباد على الله الا يعذب من لا يشرك به شيئا، فقلت: يا رسول الله، افلا ابشر الناس؟ قال: لا تبشرهم فيتكلوا.متفق عليه[2]'"**

**لێرەدا دوو ماف هەیە: مافی خودا لەسەر بەندەکانی کە بیپەرستن بیٚ هاوبەش بۆ دانانی، مافی بەدیهێنراو لەسەر خودا، کە خودا خۆی پێویستی کردووە لەسەر خۆی. خودا ئەو شتانەی کە خۆی بیەوێت لەسەر خۆی پێویست دەکات و شتانێکیش کە خۆی بیەوێت لە خۆی قەدەغە دەکات. بۆیە ویستراوی خودا لە پەرستنی، ئەو**

---

[1] الطوفي، ص٢٤٢.

[2] البخاري(٤/٢٩ ـ رقم ٢٨٥٦) ومسلم(١/٥٨/رقم٣٠).

پاداشتەیە کە بەدەستی دەهێنن لـە جێبـەجێکردن و ئەنجامـدانی ئـەم مەبەسـتەدا، واتە شایستەبوونی نیعمەت و لێڕازیبوونیان و دوورییـان لـە سـزای وەك بەخششـێك بۆیان.

## هەروەك ئەوەی خودا لەسەر خۆی پێویست کردووە

خودا چیی بوێت، لەسەر خۆی پێویستی دەکات. خودا شتانێکی لەسەر خۆی پێویست کردووە و شتانێکیشی لە خۆی قەدەغە کردووە، بەو جۆرەی کە تەواوێتیی خۆی دەیخوازێت. خودا بۆی هەیە شتانێك لە خۆی قەدەغە بکات، چونکە بڕیار لای خۆیەتی و لەبەر ئەوەی ئێمە ناتوانین شتانێك لە خودا قەدەغە بکەین، بەڵام خودا چیی بوێت لە خۆی قەدەغە دەکات، هەروەك چیی بوێت لەسەر خۆی پێویست دەکات. ئەم ئایەتە بخوێنەوە: ﴿وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ أَنَّهُۥ مَنۡ عَمِلَ مِنكُمۡ سُوٓءَۢا بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥٤﴾ [سورة الأنعام:٥٤]. ئەبو هوریرە لە فەرموودەیەکدا بۆمان دەگێڕێتەوە: لەپێغەمبەری خوداوە (دروودی خودای لەسەر بێت) کە فەرموویەتی: "لما قضى الله الخلق كتب في كتابه على نفسه، فهو موضوع عنده: ان رحمتي تغلب غضبي[1]." هەر لە فەرموودەی قودسیدا هاتووە: "يا عبادي لقد حرمت الظلم على نفسي و جعلته بينكم حراما فلا تظالموا...'الحديث[2]." بۆیە ئەگەر کەسێك پرسیی: ئایا هیچ لە خودا قەدەغەیە و ئایا هیچ لەسەر خودا پێویستە؟ وەڵامەکەی: ئەگەر ئەوەی پێویستی کردووە یا

---

[1] مسلم (٢٠١٨/٤ رقم ٢٧٥١)

[2] مسلم (١٩٤٤/٤ رقم ٢٥٧٧)من حديث ابي ذر.

قەدەغەی کردووە خۆی بێت، ئەوا بەڵێ، لەبەر ئەوەی خۆی هەر بڕیارێك دەدات کە بیەوێت، بەڵام ئەگەر بە عەقڵی خۆمان شتانێك لە خودا قەدەغە بکەین، یاخود پێویستی بکەین لەسەری، ئەوا نەخێر، چونکە عەقڵ قەدەغە و پێویست ناکات، بەڵکو قەدەغە و پێویستکردن لای خودایە[1].

## بەدیهێنراوەکان ناچار نین

مەبەست لەوەی خودا بەدیهێنراوەکانی ناچار ناکات لە بەدەستهێنانی رەهای بەرژەوەندییە پەسەندەکان، بریتییە لەوەی بەرپرسیارێتیی بەدەستهێنانی سوودی پەرستنەکان و بەرژەوەندییەکانی، بەتەواوی لەئەستۆی مرۆڤدایە، ئەمەش ئەنجامێکە لەناو چەند ئەنجامێکی بونیادنراو لەسەر چەند پێشەکییەك، ئاشکراکردنیشی بەم جۆرەیە:

**پێشەکیی یەکەم:** خودا سەرجەم پەرستنەکانی وا لێ کردووە کە بەرژەوەندییەك بن لە توانادا بن و بە هۆیانەوە بەرژەوەندی بەدەست بهێنرێت و هیچ پەرستنێك نییە کە سوودێکی بەدەر لە توانا بێت، هیچ سوودێکی پەسەندیش نییە کە لە توانادا نەبێت بەرژەوەندییەك بەدەست بهێنرێت بە هۆیەوە.

**پێشەکیی دووەم:** خودا پەرستنێکی نەخستووەتە ئەستۆی بەدیهێنراوەکانی، کە هەر تاکێکیان نەتوانێت ئەنجامی بدات، خودا دەفەرموێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ﴾ [سورة البقرة:٢٨٦].

**پێشەکیی سێیەم:** خودا هانی مرۆڤەکان دەدات بۆ بەدەستهێنانی سوودی پەرستنەکان و پاداشتیشی داناوە بۆ ئەوەی حەزی پێ بکەن، خودا دەفەرموێت:

---

[1] ابن عثيمين، شرح الاربعين النووية، ط٣، الرياض، دار الثريا، ١٤٢٥هـ ٢٠٠٤م، ص٢٤٤.

﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ [سورة آل عمران:١٣٣].

**پێشەكیی چوارەم:** خودا ڕێگریی كردووە لە وازهێنان لە بەدەستهێنانی سوودی پەرستنەكان و سزای داناوە بۆ وازهێنان وەك ترساندنێك بۆیان، دەفەرموێت: ﴿لِلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُۥ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ﴾ [سورة الرعد:١٨].

**پێشەكیی پێنجەم:** خودا ویستی داوە بە مرۆڤەكان لەوەی كە بە ویستی خۆیان فەرمانبەرداری بكەن، یاخود سەرپێچی: ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ٢٩﴾ [سورة الكهف:٢٩].

**پێشەكیی شەشەم:** لەدوای هەموو ئەمانە، خودا ڕێی چۆڵ كردووە لەنێوان بەندە و سوودی پەرستنەكان و بەرژەوەندییەكانی: خودا لە هەموو ئەرك خستنە ئەستۆیەكی مرۆڤدا وەبیریان دێنێتەوە كە ڕێی چۆڵ كردووە بۆیان، تا بەرەو میهر و قایلبوونی ئەو بچن. خودا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ١٩﴾ [سورة المزمل:١٩]. **هەروەها بۆ ڕێ چۆڵكردن لەنێوان بەرەوپێشچوون** و ڕاوەستان: خودا دەفەرموێت: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَتَقَدَّمَ أَوۡ يَتَأَخَّرَ ٣٧﴾ [سورة المدثر:٣٧]، وە بۆ ڕێ چۆڵكردن لەنێوان بەردەوام بوون یاخود نەبوون: خودا دەفەرموێت: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ٢٨﴾ [سورة التكوير:٢٨].

بونیاد لەسەر ئەوەی ڕابورد، دەكرێت چەند ئەنجامێك دەست بخەین كە لە ڕاستیدا لە بەڵگەنەویستەكانی شەرعن، ئەوانیش:

**ئـــەنجامی یەکـــەم:** خـــودا بەنـــدەی ناچـــار نـــەکردووە لەســـەر بەدەســـتهێنانی سوودەکان و ئەنجامی دووەمیش لەمەوە سەرچاوە دەگرێت.

**ئـــەنجامی دووەم:** بەرپرســـیارێتیی بەدەســـتهێنانی ســـوودی پەرســـتنەکان و بەرژەوەندییـــەکانی تـــەنها لەئەســـتۆی مرۆڤدایـــە و ئـــەنجامی ســـێیەمیش لەمـــەوە سەرچاوە دەگرێت.

**ئەنجامی سێیەم:** لێگەڕان بۆ بژاردەی بەنـدە خـۆی لـە سـوودی پەرستنەکان و بەرژەوەندییەکانی لە دنیا و دواڕۆژدا، کە لە توانایدا بووە بەدەستی بێنێت و ناچـار نەبووە و ڕێی بۆ چۆڵ کراوە بۆ گەیشتن بەو سوود و بەرژەوەندییانـە، ئـەوە خـۆی ستەمی لە خۆی کردووە و خودا هیچ ستەمێکی لێ نەکردووە.

خودا دەفەرموێت: ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾﴾ [سورة هود:١٠١]. **هەروەها دەفەرموێت:** ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِن قَبْلُ ۖ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٨﴾﴾ [سورة النحل:١١٨]. **هەروەها دەفەرموێت:** ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِن كَانُواْ هُمُ ٱلظَّالِمِينَ ﴿٧٦﴾﴾ [سورة الزخرف:٧٦]. ئەمەش دەرهاویشتەکانی قەدەغەکردنی ستەمە، کە خودا لە خۆی قەدەغە کردووە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: "یا عبادي لقد حرمت الظلم على نفسي و جعلته بينكم حراما فلا تظالموا[1]." لەمەوە دەردەکەوێت کە بژاردە دانە دەست مرۆڤ و ناچارنەکردنی لە بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکانە و ئەنجامی قەدەغەکردنی ستەمیشە لەلایەن خوداوە لە خۆی. ئەم واتایانەش بەتێروتەسەلی قسەی لەسەر کراوە لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و

[1] مسلم (١٩٤٤/٤ رقم ٢٥٧٧).

جەماعەت لە "ناچاری و بڕیار بە ویستی خۆ بوون(التسيير و التخيير)" لەژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودەدا[1] و لە چەند ڕوویەکەوە، ئەوانیش:

**یەکەم:** سەلمێنراوە کە میهر و زانستی خودا هەموو شتێکی گرتۆتەوە و لە لەوحی پارێزراو(لوح المحفوظ)دایە ئەوەی تا ڕۆژی دوایی دەبێت، ویست و تواناشی هەموو شتێکی گرتووەتەوە، هەموو کاروبارێك بە دەستی خۆیەتی و هیچ ڕێگرییەك نییە لەوەی کە ئەو داویەتی و کەس ناتوانێت بڕیاری ئەو ڕەد بکاتەوە و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.

دەقەکانی قورئان و فەرموودەش بەڵگەن لەسەر ئەم بابەتە و هاوواتاکانی، ئەوانیش زۆر و زانراون لای زانایان و هەر کەسێکی تریش کە دەیەوێت بیبینێت لە قورئان و فەرموودەدا، بۆ وێنە: خودا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ﴾ [سورة الأنفال:٧٥]. **هەروەها دەفەرموێت:** ﴿ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّٰرُ﴾ [سورة الرعد:١٦] و دەفەرموێت: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ﴾ [سورة القمر:٤٩] و دەفەرموێت:﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ [سورة الإنسان:٣٠] و دەفەرموێت: ﴿يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ [سورة الرعد:٣٩] و دەفەرموێت:﴿ما أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴾ [سورة الحديد:٢٢]، و دەفەرموێت ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ﴾ [سورة يونس:٩٩] و دەفەرموێت﴿وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا

---

[1] فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء، جمع وترتيب: أحمد بن عبد الرزاق الدويش، المجموعة الأولى: العقيدة، الايمان بالقضاء والقدر، التسيير والتخيير في ضوء الكتاب والسنة، فتوى رقم٤٦٥٧، دار المؤيد، الرياض (ج:٣/ص٣٨٧ ـ٣٨٠).

﴿وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ مِنِّي لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ١٣﴾ [سورة السجدة:١٣].

ئــەوەی لــە پێغەمبــەری خــوداوە پێمــان گەیشــتووە کــە هانــدانی تیایــە لەســەر یادکردنەوەی دوای نوێژ: "لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك و له الحمد و هـو على كل شئ قدير، اللهم لا مانع لما اعطيت و لا معطي لمـا منعـت و لا ينفـع ذا الجـد منك الجد[١]." هەروەها ئەوەی لە فەرموودەکەی عمر (خـوا لێـی رازی بێـت) هـاتووە دەربارەی پرسیارەکەی (جبريل) کە پرسیی لـە پێغەمبـەری خـودا(دروودی خـودای لەسەر بێت) دەربارەی باوەڕ، پێغەمبەریش وەڵـامی دایـەوە و فـەرمووی: "ئەوەیـە کـە بـاوەڕت هـەبێت بـە خـودا و فریشـتەکانی و کتێبـەکانی و پێغەمبـەرانی و رۆژی دوایی و ئەندازەگیریی چاك و خراپی لای خوداوەیە." ئـەم دەقانـە و هاوواتاکانیـان بەڵگەن لەسەر تەواویی زانستی خودا بەوەی کە هەبووە و هەیە بەو ئەندازەگیرییەی سەرجەم کاروبـاری بـەدیهێنان و ویسـت و توانـای بەگشـتی، ئـەوەی خـودا ویسـتی دەبێت و ئەوەی نەیویست، نابێت[٢].

**دووەم:** سەلمێنراوە کە خودا دانایە لە بەدیهێنان و بـەڕێوەبردن و یاسـادانی دا، میهرەبانە بەرامبەر بەنـدەکانی. خـودا پێغەمبـەرانی نـاردووە و یاسـاکانی دانـاوە و فـەرمانی کـردووە بـە هەریـەکێکیان بیگەیـەنێت بـە نەتەوەکـەی و داوای لـە کـەس نەکردووە کە لە توانایدا نەبێت، وەك میهرەبانی و بەخششی خۆی.

بۆیـە تـەکلیف لەسـەر شـێت نییـە تـا عـەقڵی بـۆ دەگەڕێتـەوە، منـداڵیش تـا پێدەگات، بیانووی داوەتە خەوتوو تا بەخەبەر دێت و کەسێك لەبیری چووە تا بیری

---

[١] رواه البخاري (١٦٨/١ و ٧٢/٨ و ١٢٦ و٩٥/٩ ارقام: ٨٤٤، ٦٣٣٠، ٧٢٩٢، ٦٦١٥).

[٢] رواه مسلم (٣٦/١ رقم٨) عن عمر (رضي الله عنه).

دەکەوێتەوە، بێدەسەڵات تا دەتوانێت، کەسێکیش کە بانگەوازی پـێ نەگەیشـتووە تا پێی دەگات، وەك میهرەبانی و چاکەی خۆی.

پاشان خودا ناوبژیوانێکی دادگەری بەرزی دانایە، هیچ ستەمێك ناکات ئەگەرچی هێندەی گەردیلەش بێت، بەخشندەیە و چاکەکان چەند هێندە دەکات و لە خراپەکانیش دەبورێت، ئەمە سەلمێنرا بە کرداری روون و بەڵگەی راست، بۆیە لەگەڵ تەواویی دانایی و فراوانیی میهر و لێخۆشبوونی نایەتەوە، داوایەك لە بەندەکانی بکات بێ ئەوەی ویست و بژاردەیان لەدەستدا بێت بۆ ئەوەی بیکەن یاخود وازی لێ بێنن و توانای ئەوەیان نەبێت کە دەیانەوێت بیکەن. ئەستەمە لە دادگا دادەکەیدا و داناییە زۆرەکەی، کە سزایان بدات لەسەر شتێك کە بەناچاری کردوویانە. بۆیە ئەندازەگیریی پتەوی دادگەرانەی خودا و بڕیاردانی جێبەجێکردن لە بیروباوەڕی باوەڕی جێگیرە، کە دەبێت گوێڕایەڵی بکرێت و چەسپاندنی بژاردەی مرۆڤ و توانای جێبەجێکردنی ئەوەی لەسەریانە کە لە شەرعدا هاتووە و عەقڵیش بڕیاری لەسەر داوە، هیچ دەربازبوونێك نییە لە خۆڕادەستکردن و گوێڕایەڵیکردنی. ئەگەر عەقڵی مرۆڤ فراوان بوو بۆ تێگەیشتن لەو نهێنییەی تێیدایە، دەبێت ستایشی خودا بکات کە رێنمایی کردووە و ئەگەر لە توانایدا نەبوو لێی تێبگات، ئەوە با کاروباری خۆی بداتە دەست خودا و خۆی تۆمەتبار بکات بە کەمتەرخەمی لە تێگەیشتن لە راستییەکان و ئەوەش حاڵیەتی زۆربەی کات، خودا تۆمەتبار نەکات لە ئەندازەگیری و بڕیار و یاسا و پاداشتی، چونکە خودا بەرز و توانا و دانا و شارەزایە، پاك و بێگەردی بۆ خودا لەوەی وەسفی پێ دەکەن و ئاشتی لەسەر پێغەمبەران و ستایش بۆ خودای خاوەنی جیهانەکان و با کۆڵ بدات لە قسەکردن دەربارەی، نەوەك تووشی هەڵخزان ببێت و بکەوێتە دوودڵییەوە و با بڕوا بێنێت رازیبووانە و ڕادەست بە وەڵامی پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێت) بۆ یارانی، کاتێك سووڕانەوە لەنزیکی ئەم گەرمییە. (علی کوڕی ابی طالب)

(خوا لێی رازی بێت) فەرمووی[1]: "لەگەڵ پێغەمبەری خودا(دروودی خودای لەسەر) بووین لە بەقیعی غەرقەد لەگەڵ تەرمێك، فەرمووی کەسێك نییە لە ئێوە مەگەر جێیەکی بۆ دانراوە لە بەهەشت و جێیەکیش لە دۆزەخ، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا، دانیشین–واتە کار نەکەین–، فەرمووی بەڵکو کار بکەن، چونکە هەر کەس کار بۆ ئەوە دەکات کە بۆی دانراوە." پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ۝٧﴾ [سورة الليل:٥-٧][2].

ئەوەی چەسپاوە بە کرداری روون و فەرمایشتی راست، خودا لەگەڵ تەواوی دانایی و میهری و فراوانی لێبوردەیی، داوا لە بەندەکانی ناکات کە توانا و بژاردەی جێبەجێکردن و وازهێنانیان نەبێت، ئەستەمە لە بڕیاری دادگەرانەی و دانایی زۆریدا، سزایان بدات لەسەر شتانێك کە بەناچاری کردوویانە.

**پوختەی ئەم بەشە:** خودا هەر شتێك بەرژەوەندیی بەندەکانی تێدایە بۆی ئاشکرا کردوون و کارئاسانیی بەدەستهێنانی بۆ کردوون، هەر کارێکیش زیانی تێدایە، ئاشکرای کردووە بۆیان و کارئاسانیی کردووە بۆ دوورکەوتنەوە لێی. پاشان ئەو بەرژەوەندییانەی خودا ناردوویەتی بۆ خەڵکی، بەشێکی وەرگیراوە لە بەرژەوەندیی رەهای بەندەکان، کە خودا کردوویەتی بە مەبەستێك لە مەبەست و بنەڕەتە شەرعییەکان. بۆیە هیچ فەرمانێکی شەرعی خاڵی نییە لێی وەك میهر و بەخششی خودا، هەروەك پێویستی کردووە لەسەر خۆی و بێ ناچاریکردن لەلایەن بەدیهێنراوەکانی.

---

[1] رواه البخاري، في تفسير القرآن (٤٦٦١) ومسلم (٢٦٤٧) وسنن الترمذي، تفسير القرآن (٣٣٤٤)وسنن أبو داود، السنة (٤٦٩٤) وسنن ابن ماجة، المقدمة (٧٨)ومسند أحمد بن حنبل (١٢٩/١).

[2] رواه البخاري، الجامع الصحيح (١٧٠/٦ ـ١٧١ و٤٨/٨ و١٢٣ و١٦٠/٩ ارقام: ٤٩٤٥ ـ٤٩٤٩ـ٦٢١٧ـ ٦٦٠٥ـ ٧٥٥٢) ومسلم في الصحيح (٢٠٣٩/٤ ـ ٢٠٤٠رقم٢٦٤٧). وفتاوى اللجنة الدائمة للبحوث والافتاء، فتوى ٤٦٥٧، ج٣ ص٣٨٠ ـ٣٨٧.

# هێڵكاریی مەبەستی شەرعیی رەها



# بەشی چوارەم
# سیستمی پەیوەندییە مەبەستییەکان

پێشــتر واتــای بــەکارهێنراوی وشــەی (سیســتم)مان بــۆ مەبەســتەکانی ئــەم لێکۆڵینەوەیـە روونکـردەوە، کـە بـۆ ئاماژەکردنـە بـۆ شـتێکی پێکهـاتوو لـە چـەند بەشـێکی پەیوەسـت و چـالاك لـەناو خۆیـان. هـەر بەشـێکیش تایبەتـە بـە کـارێکی دیـاریکراو لەگـەڵ بـوونی هاریکـاری و تـەواوکاری لـەنێوان بەشـە جیاوازەکـان لـە جێبــەجێکردنی کارەکانیــان. سیســتمیش بــەم تێگەیشــتنە لــە فەرمایشــتی پێغەمبەردا(درودی خودای لەسـەر بێت)واتاکـەی هـاتووە: "وێنـەی بـاوەڕداران لـە خۆشەویســتی و هاوســۆزی و میهرەبــانی وەك یــەك جەســتە وایــە، ئەگــەر هــەر ئەندامێکی ئازاری هەبوو، ئەوا هەموو جەستەکە تووشی بێخەوی و تا دەبێت[1]."

[1] البخاري(١٠/٨ رقم ٦٠١١) ومسلم(١٩٩٩/٤ رقم٢٥٨٦).

## پەیوەندیی نێوان ڕەهای مەبەستەکان و مەبەستی ڕەها

لە دەستەواژەی زانایانی فیقهدا، فەرمانی ڕەها (مەبەستی شەرعیی ڕەها) تایبەت کراوە بە گشتییەکی سەرتاپاگیر بەبێ ئاوڕدانەوە بەلای نزیکیدا، لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی جگە لە خۆی لە مەجازێکی شەرعییە، ئەگەرچی ڕاستییەکی زمانەوانییە. ڕەهای فەرمانیش (ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان)، تایبەت کراوە بە جگە لە گشتییەکی سەرتاپاگیر، کە ئەویش ئەندازەی هاوبەشی ڕەگەزی جیاکراوەیە بە پاڵدانە لا، بێ ئاوڕدانەوە بەلای نزیکیدا، بۆیە بەکارهێنانی لە گشتیی گشتگیردا، مەجازێکی شەرعییە، ئەگەرچی ڕاستییەکی زمانەوانییشە. لێرەوەیە (مەبەستی شەرعیی ڕەها) گشتییە و هیچ سنووردارکەرێکی لەسەر نییە کە تایبەتی بکات چ مەرج بێت، یاخود سیفەت یا جگە لەمانیش لە پاشکۆکانی گشتی: کە تایبەتکردنی گشتگیری بخوازێت لە سەرجەم تاکەکانی مەبەستەکان، بە جۆرێك کە هیچ مەبەستێك نامێنێت نەچێتە ناوی و (ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان)، بریتییە لە ئەندازەی هاوبەشی نێوان سەرجەم جۆرەکانی مەبەستەکان و ئەویش ناو نراوە بە مەبەست، کە ناوێکی ڕاستە بۆ تاکێك لە تاکەکانی مەبەستەکان، بۆیە وشەی ڕەهایان کردووەتە ئاماژەیەك بۆ ئەندازەی هاوبەشی تایبەت بە هەر تاکێك.

پێشتر ئاشکرا بوو کە ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان بریتییە لە (ڕەهای بەرژەوەندی) و ئەویش کاری بەشی هاوبەشی نێوان سەرجەم مەبەستە شەرعییەکانە کە هیچیان خاڵی نین لێی. بۆیە بە هۆیەوە مەبەستە شەرعییەکان جیا دەکرێنەوە لە مەبەستەکانی تر، هەر بە هۆیەوە مەبەستێکی شەرعی جیا دەکرێتەوە لە مەبەستە شەرعییەکانی تر، هەروەك پێشتر ئاشکرا بوو کە مەبەستی

شەرعیی ڕەها بریتییە لە (بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان) و ئەمەش ویستراوی هەر مەبەستێکی شەرعییە و هیچیان خاڵی نین لێی.

(ابن القیم الجوزیة) جیاکاری کردووە لەنێوان فەرمانی ڕەها و ڕەهای فەرمان لە دە ڕووەوە[١]، کە لەدوای ئەوەی دایبەزاندووەتە سەر ڕەهای مەبەستی شەرعی (ڕەهای بەرژەوەندییەکان) و جیاوازیی نێوان ئەم و مەبەستی شەرعیی ڕەها (بەرژەوەندیی ڕەها)، ئەوانیش:

١: مەبەستی شەرعیی ڕەها (بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان) دابەش ناکرێن بۆ سوننەت و شتی تریش کەواتە دابەشکردن نایانگرێتەوە، ڕەهای مەبەستی شەرعییش (ڕەهای بەرژەوەندییە شەرعییەکان) دابەش دەکرێن بۆ پێویست و سوننەت، بۆیە ڕەهای مەبەستی شەرعی دابەش دەکرێت، لە کاتێکدا مەبەستی شەرعیی ڕەها دابەش ناکرێت.

٢: مەبەستی شەرعیی ڕەها (بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان)، تاکێکە لە تاکەکانی ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان (ڕەهای بەرژەوەندییە شەرعییەکان)، بەڵام بەپێچەوانەوە ڕاست نییە.

لەبەر ئەوە بەرژەوەندیی ڕەها، تاکێکە لە تاکەکانی ڕەهای بەرژەوەندییەکان لە سێ ڕووەوە:

**ڕووی یەکەم:** کە (بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان) جا لە ڕووی ڕاستییەوە یا لە ڕووی حوکمەوە، هەردووکیان لە تاکەکانی ڕەهای مەبەستە شەرعییەکانن بە ڕوانین لە ڕەهای بەرژەوەندییەکان لە ژیانی دنیا و دواڕۆژدا. **ڕووی دووەم:** کە

---

[١] ابن قیم الجوزیة، بدائع الفوائد، تحقیق: محمد الاسكندراني، ط١، بیروت، دار الکتاب العربي، ١٩٩٩م، ٨٢١/٤.

(بەرژەوەندیی رەهای بەنـدەکان) لـە راسـتیدا لـە تاکـەکانی رەهـای بەرژەوەندییـە شەرعییەکانە، بە تێبینی رەهای مەبەستەکان تەنها لە دوارۆژدا.

**رووی سـێیەم:** کـە (بەرژەوەنـدیی رەهـای بەنـدەکان) لـە رووی حوکمـەوە لـە تاکەکانی بەرژەوەندییە شەرعییەکانە، بە روانین لە رەهای بەرژەوەندییەکان تـەنها لە دنیادا.

٣: نەهێشـتنی رەهـای مەبەسـتە شـەرعییەکان (رەهـای بەرژەوەندییـە شـەرعییەکان)، پێویسـت دەکـات بـە نەهێشـتنی مەبەسـتی شـەرعیی رەهـا (بەرژەوەنـدیی رەهـای بەنـدەکان) و بەپێچـەوانەوە راسـت نییـە، لەبـەر ئـەوەی نەهێشـتنی رەهـای بەرژەوەندییـە شـەرعییەکان لـە راسـتیدا نەهێشـتنی رەگـەزی بەرژەوەندییە، کە نەهێشتنی سەرجەم جۆرەکانی پێویست دەکات بیّ هەڵاوێردن.

٤: چەسـپاندنی رەهـای مەبەسـتە شـەرعییەکان (رەهـای بەرژەوەندییـە شـەرعییەکان)، پێویسـت ناکـات بـە چەسـپاندنی مەبەسـتی شـەرعیی رەهـا (بەرژەوەندیی رەهای بەندەکان) نەك بەپێچەوانەوە، چـونکە چەسـپاندنی رەگـەزی بەرژەوەندی (رەهای بەرژەوەندییە شەرعییەکان)، پێویست ناکات بـە چەسـپاندنی سەرجەم جۆرەکانی ئەم رەگەزە، لەبەر ئـەوەی رەنگـە یـەکێك لـە جۆرەکـانی جیـا ببێتـەوە و لەوانـەش (بەرژەوەنـدیی رەهـای بەنـدەکان)، بۆیـە پێویسـت ناکـات بـە چەسپاندنی بەرژەوەندییەکان، چەسپاندنی بەرژەوەندیی رەها.

٥: مەبەسـتی شـەرعیی رەهـا (بەرژەوەنـدیی رەهـای بەنـدەکان)، جۆرێکـە لـە رەهـای مەبەسـتی شـەرعی (رەهـای بەرژەوەنـدیی شـەرعی) و رەهـای مەبەسـتی شـەرعی (رەهـای بەرژەوەنـدیی شـەرعی)، رەگـەزی مەبەسـتی شـەرعیی رەهایـە (بەرژەوەندیی رەهای بەندەکان).

٦: مەبەستی شەرعیی ڕەها (بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان)، سنووردارە بە ڕەهای وشەکە، بێسنوورە بەپێی واتا و ڕەهای مەبەستی شەرعی (ڕەهای بەرژەوەندییە شەرعییەکان)، بێسنوورە بەپێی واتا و بەکار هێنراوە بە سنوورداری و جگە لەویش بەپێی واتا. هەرچی بەکارهێنانیەتی بە سنوورداری، وەك سەرجەم تاکەکانی مەبەست لە یاسادانان و بەدیهێنانی بەدیهێنراوان و ئەو بەرژەوەندییانەی لەسەریان دەوەستن. هەرچی بەکارهێنانی لە جگە لە سنووردارییدا، وەك سەرجەم تاکەکانی بەرژەوەندیی بەندەکان.

٧: مەبەستی شەرعیی ڕەها (بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان) بۆ سنوورداریی نابێت، چونکە بنەڕەت لە بەرژەوەندیدا ڕەهاییە نەك سنوورداری، ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان (ڕەهای بەرژەوەندییە شەرعییەکان) لە ڕوویەکەوە بۆ بێ سنووری دەگونجێت، کە ئەو ڕووەیە سەرجەم بەرژەوەندییەکانی لەسەری دەوەستن، بنەڕەت تیایاندا سنوورداریە و دەگونجێت بۆ سنوورداری لەو ڕووەی کە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی ڕەهای مەبەستی شەرعی، بەرژەوەندییەکەی سنووردارە بەم جۆرەوە.

٨: مەبەستی شەرعیی ڕەها (بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان) سنووردارە بە سنووری ڕەهایی. چونکە ڕەهایی و سنوورداری لەخۆ دەگرێت و ڕەهای مەبەستی شەرعی (ڕەهای بەرژەوەندییە شەرعییەکان) سنووردار نییە، ئەگەرچی هەندێك تاکی سنووردارە.

٩: مەبەستی شەرعیی ڕەها (بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان) ناوترێت، مەگەر بۆ تەواوی نەبێت، تەواویی فەرمانپێکراو و ڕەهای مەبەستی شەرعی (ڕەهای بەرژەوەندییە شەرعییەکان) دەوترێت بۆ تەواو و کەم(ناتەواو)یش.

١٠: ئەگەر وتت مەبەستی شەرعیی رەها (بەرژەوەندیی رەهای بەندەکان)، ئەوە حەرفی (لام)ت خستووەتە سەر مەبەستی شەرعی، ئەویش واتای گشتی و سەرتاپاگیری دەگەیەنێت، پاشان وەسفت کردووە بە رەها، بە واتای ئەوەی سنووردار نەکراوە بە سنوورێك کە تایبەتی بکات لە مەرج و سیفەت و جگە لەمانیش، چونکە گشتییە بۆ هەموو تاکێك لەو تاکانەی وەك ئەون، هەروەك بەرژەوەندییە پەسەندەکان گشتین بۆ هەر تاکێك لە تاکەکانی مەبەستەکان، واتە مەبەستەکە رەهایە نەك هاوبەشی. بەڵام رەهای مەبەستی شەرعی، ئەوە پاڵدانە لایەکە بۆ جیاکردنەوەیە نەك بۆ گشتاندن، چونکە ئەوە ئەندازەی هاوبەشی رەهایە نەك گشتی، تا راست بێت بۆ تاکێك لە تاکەکانی، واتە هاوبەشەکە رەهایە نەك مەبەستەکە خۆی.

## سیستمی پەیوەندیی بەرژەوەندی بە مەبەستەوە

لێرەدا ئەو رۆڵە دەخەینە روو کە بەرژەوەندییە پەسەندەکان پێی هەڵدەستن پەیوەست بە مەبەستەکان، سەرەڕای رۆڵی هۆکارە سەربەخۆ و شوێنکەوتوو و نێوەندگیرەکان.

بەپێی ئەوەی رابورد، لەم لێکۆڵینەوەیە دەگەینە ئەو ئەنجامەی: کە پێوەری سەرەکیی سیستمی پلەبەندیی مەبەستە شەرعییەکان بریتییە لە بەرژەوەندییە پەسەندەکان بەپێی شەرع. بەرژەوەندییە پەسەندەکان بەپێی شەرع لە پارە کاڵائاساکان دەچن ــ بەتەواوی ــ لە رووی ئەو رۆڵەوە کە دەیگێڕێت، وەك پێوەری سوودەکان لەنێوان مەبەستە شەرعییەکان[1].

---

[1] پارە کاڵاییە تەواوەکان (النقود السلعیة الكاملة) وەك سکە ئاڵتوونییەکان توخمی (الاثمان)ی تێدا نییە، چونکە نرخی کاڵابوونی وەك نرخی بازرگانییەکەی وەهایە.

لە مێژووی پارەدا باس دەکرێت، کە مرۆڤەکان پارەی کاڵائاسایان بەکار هێناوە بۆ زاڵبوون بەسەر قورسییەکانی کڕین و فرۆشتن بە هۆی قورسیی گونجاندن لەنێوان حەزەکان و قورسیی زانینی ڕێژەی یەکسانی و قورسیی هەڵگرتن، قورسیی بوونی هۆکاری لەبار بۆ شتانەی دواتر دەدرێن ـ قەرز(وەرگێڕ) ـ. پارەی کاڵائاسا بەکار هێنراوە، بەتەنها بۆ هێنانەدی پێوانی بەها، پاشان خەڵکی دەستیان کرد بە بەکارهێنانی وەك نێوەندگیری کڕین و فرۆشتن. مەرجی پەسەندیش لە پارەی کاڵائاسا بریتییە لە یەکسانیی بەهای نەقدییەکەی لەگەڵ بەها کاڵاییەکەی، چونکە پارەی کاڵائاسا تەنها وەك نەقد بەکار نایەت، بەڵکو کاڵایەکیشە لەپاڵ بەکارهێنانە نەقدییەکەی[1]. ئەم مەرجەش بۆ هەموو پارە کاڵائاساکان ڕاست نییە، بەڵکو شوێنەوارەکەی وا دەردەخات کە بۆ پارەی کاڵائاسای کانزاییە[2].

بەرژەوەندییە پەسەندەکان بەپێی شەرع، هاوشێوەی پارەی کاڵائاسایە بەتەواوی، لەو ڕووەوە کە بەهای چەندێتیی مەبەستە شەرعییەکانی پێ دەپێورێت، چونکە ئەو ئەندازە هاوبەشەیە کە دەدرێتە پاڵ ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان بێ ئاوڕدانەوە بەلای نزیکەکانی و لەو ڕووەوە کە بەهای چۆنێتیی بەهای مەبەستی

---

[1] ئەسڵ ئەوەیە کە دروست نەبێت پارە وەك کاڵا بەکار بهێنرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی پارە کاڵاییە تەواوەکانی وەك سکە ئاڵتوونییەکان ئەو سیفەتەی تێدایە کە باسمان کرد، ئەوا دروستە وەك کاڵایەکیش بەکار بهێنرێت، چونکە سیفەتی کاڵابوونی زاڵترە بەسەر سیفەتی پارەبوونیدا. ئەمەش لەو پارە کاڵاییە تەواوانەدایە کە ئەنجامی دەرکردنی نرخە کاڵاییەکەی لە نرخە پارەییەکەی دەکاتە سفر.

[2] المباركفوري وآخرون، هـ . س . ٣٣٧/١. وابن فارس، مقايس اللغة، تحقيق وضبط:عبدالسلام محمد هارون، بيروت، دار الجيل، ٩٥/٣ ص٢٣. والجرجاني: علي بن محمد الشلايف، معجم التعريفات الفقهية، تحقيق: محمد صديق المنشاوي، القاهرة، دار الفضيلة، ص٣٢٥. والنقود واعمال البنون، د. مجد مظلوم، ص١٠. وخليل، سامي، مبادي ء الاقتصاد الكلي، ط ١، ١٩٨٠م، الكويت، مؤسسة الصباح، ٥٦٧، هەروەها بڕوانە:
L.V. Chander3rd. The economics of money and banking . Harper & Row. New York. 1963.p16.

شەرعیی پێ دەپێورێت، چونکە ئەو کارە گشتی و سەرتاپاگیرەیە کە دەدرێتە پاڵ مەبەستیی شەرعی رەها بێ ئاوڕدانەوە لە نزیکەکانی.

ئەمەش واتا بەرژەوەندی بەتەنها کاریگەر نییە و بێلایەنە، چونکە بەرژەوەندی نازانرێت تا نەدرێتە پاڵ شتێکی تر، بەڵکو دەرخەر و ئاشکراکەری بەهای مەبەستی شەرعییە لە رووی چەندێتی ـ بڕی سوود ـ و لە رووی چۆنێتی ـ پلەی سوود ــ و ئەمەش ئەو تایبەتمەندییەیە کە بەهای راستەقینەی داوەتە بەرژەوەندییەکان.

لەمەوە دەردەکەوێت، بەرژەوەندیی پەسەند بەپێی شەرع، هۆکاری سەربەخۆیە: ئەویش ئەوەیە کە کاریگەریی راستەوخۆی هەیە، هەر کات درایە پاڵ مەبەستە شەرعییەکان و سوودی دەبێت لە ئەندازەگیری و راڤە و تێگەیشتنی بڕ و پلەی سوود کە گۆڕاوە و بەتێبینیکردنی سەرەنجام و کاریگەری. مەبەستە شەرعییەکانیش دەبنە گۆڕاوە شوێنکەوتووەکان: ئەویش ئەو مەبەستە شەرعییانەن کە جێی پێوان و ئەندازەگیری و لێکۆڵینەوەن بۆ زانینی رێوشوێن و هۆکاری بەدەستهێنانی لە داهاتوودا. دەوروبەریشی لە کات و شوێن و مرۆڤ و بار، گۆڕاوە نێوەندگیرییەکانن: ئەوانیش ئەو شتانەن کە دەردەبڕدرێن لە رێی کاریگەریی بەرژەوەندییەکان لەسەر پێوان و ئەندازەگیریی مەبەستەکان.

## سیستمی پەیوەندیی نێوخۆیی مەبەستە شەرعییەکان

لێرەدا جۆری یەکەم دەخەینە روو لە پلەبەندیی جۆری ئاستی پەیوەندییە مەبەستییەکان، ئەویش ئاستی پەیوەندیی نێوخۆییە: لەنێوان مەبەستە شەرعییەکان خۆیان و ئاستە لاوەکییەکانی و ئاستی پەیوەندیی لەنێوان تاکەکانی رەهای مەبەستە شەرعییەکان و مەبەستی شەرعیی رەها، سەرەڕای جۆری یەکەم لە پلەبەندیی سیستمی مەبەستەکان کە ئەویش سیستمی کراوەیە.

حوکمــە شــەرعییە راســتەکان سیســتمێکی تــەواوە، ئەمــەش دەخوازێــت کــە پەیوەندیی نێوان تاکەکانی حوکمی شەرعیی پەیوەندییەکی تـەواو بێـت، بـە واتـای تــەواوی پەیوەســتی لــەنێوان حــوکمێکی شــەرعی و حــوکمێکی شــەرعیی تــر و بــە شــێوەیەکی دیــاریکراو، لەبــەر ئــەوەی مەبەســتە شــەرعییەکان حــوکمی شــەرعیی ویستراون، بۆیـە پەیوەسـتن بەیەکـەوە لـەناو خۆیـان، پەیوەسـتییەکی تـەواو و بـە پەیوەندییــەکی تــەواو واتــە بــە سیســتمێکی کــراوەی تــەواو، نموونــەش لەســەر دابەشکردنەکانی ئەم پەیوەندییە لە هەژمار نایەت.

بەم پێیە پەیوەندیی نێوان مەبەستە شەرعییەکان لە جۆری سیستمی کراوەیە و لە دوو ئاستدایە: **ئاستی یەکەم:** ئاستی سیستمی رەهای کراوە و ئەمیش سروشـتی پەیوەندییە لەنێوان تاکەکانی رەهـای مەبەسـتە شـەرعییەکان لـە لایـەك و لـەنێوان مەبەستی شەرعیی رەها لە لایەکی ترەوە، درێژەی ئەو بابەتەش بەم شێوەیەیە[١]:

**هۆکار(سبب):** هەر مەبەستێك هۆکارە یاخود بەشـێکی هۆکـارە بـۆ مەبەسـتێکی تــر، بۆیــە هــەر مەبەســتێك (رەهــای مەبەســتی شــەرعی) هۆکــارە، یــاخود بەشـێکی هۆکارە بۆ بەرژەوەنـدیی رەهـای بەنـدەکان (مەبەسـتی شـەرعیی رەهـا) بـۆ وێنـە: پاراستنی سامان هۆکارێکی تەواوە بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی سامانی پارێزراو و بەشێکیشە لە بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی رەهای بەندەکان.

**مەرج(شرط):** هەر مەبەستێك مەرجە یاخود بەشێکی مەرجێکـە بـۆ مەبەسـتێکی تر. هەر مەبەستێکی شەرعی –رەهای مەبەستی شەرعی– مەرجـە یـاخود بەشـێکی مەرجە بۆ بەرژەوەندیی رەهـای بەنـدەکان (مەبەسـتیی شـەرعیی رەهـا) بـۆ وێنـە: چــاوەڕێی پاداشــت لــە ئەنجامــدانی کارێــك بەدروســتی، مــەرجێکی تــەواوە بــۆ

[١] ئەم وردەکارییـە پوختـەی دیدگـەی توێـژەرە لـە لێکۆڵینـەوەی سیسـتەمی پلەبەندییـەکانی مەبەسـتە شەرعییەکانە.

بەدەســـتهێنانی بەرژەوەنـــدیی ئەســـتۆپاکی و بەشێکیشـــە لـــە مەرجـــەکانی بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان لە وەرگێرانی کردەوە لای خودا.

**ئامانج(الغاية):** هەر مەبەستێك، ئامانج یاخود بەشێك لـە ئامـانجی مەبەسـتێکی تـرە. بۆیـە هـەر مەبەسـتێکی شـەرعی (ڕەهـای مەبەسـتی شـەرعی) ئامـانج یـاخود بەشێکی ئامانجە بۆ بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان (مەبەستی شەرعیی ڕەهـا)، بـۆ وێنە: ئامانج لە پەرستن بەدەستهێنانی تەواوی بەرژەوەنـدیی خۆویسـتانەی چـوونە ناو بەندایەتییەوەیە و بەشێکیشە لە ئامانجی بەدەسـتهێنانی بەرژەوەنـدیی چـوونە ناو سۆز و میهری خودا –بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان–.

**هـۆ(وسـيلة):** هــەر مەبەســتێك، وەســیلەیە یــاخود بەشــێکی وەســیلەیە بــۆ مەبەستێکی تر. هەر مەبەستێکی شەرعی (ڕەهـای مەبەسـتی شـەرعیی)، بـۆ وێنـە: کردنــی فەرمانــەکان یــاخود نــەکردنی قەدەغــەکان، هۆیەکــە بــۆ بەدەســتهێنانی بەرژەوەندیی بەندەکان و بەشە هۆکیشە بـۆ بەدەسـتهێنانی (بەرژەوەنـدیی ڕەهـای بەندەکان) کە چوونە ناو سۆز و میهری خودایە.

**شوێنکەوتوو(تابع):** هەر مەبەستێك بنەڕەت یاخود شـوێنکەوتووی مەبەسـتێکی ترە، یاخود بەشێکە لـەوە. هـەر مەبەسـتێك (ڕەهـای مەبەسـتی شـەرعی) بنـەڕەت یاخود شوێنکەوتوو، یاخود بەشێکە لە بنەڕەت یاخود شوێنکەوتووی بەرژەوەنـدیی ڕەهای بەندەکانە –مەبەستی شەرعیی ڕەها). بۆ وێنە: پاراستنی نـەفس و عـەقڵ و وەچــە و ســامان بەرژەوەنــدیی شــوێنکەوتووی بەرژەوەنــدیی پاراســتنی ئــایینن، بەشێکی شوێنکەوتوویشە لە: بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان.

تەواوکاری: بوونی هەر مەبەستێك و بەدەستهێنانی، بوون یاخود تەواوکارییە بـۆ مەبەسـتێکی تـر و بەدەسـتهێنانی. هـەر مەبەسـتێکی شـەرعی (ڕەهـای مەبەسـتی شەرعی) بوون و بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکانە (مەبەستی شەرعیی

رەها). بۆ وێنە: پاراستنی ئایین، بەدەستهێنان یاخود تەواوکاریی بوونی ئایینە کە ئیسلامە، هەروەك گەیاندن و تێگەیاندنیش بەدەستهێنان و تەواوکاریی چەسپاندنی بەڵگەیە لەسەر بەندەکان. سەرجەم مەبەستە شەرعییەکان (رەهای مەبەستی شەرعیی) بەدەستهێنان و تەواوکاریی ویستراوی مەبەستەکانە (مەبەستیی شەرعیی رەها)، ئەویش بەرژەوەندیی رەهای بەندەکانە.

هەماهەنگی: دووبارە پلەبەندی و دابەشکردنەوەی مەبەستەکان بە هەر مەبەستێکی رێگەپێدراو، سروشت و جۆری پەیوندی ناگۆڕێت لەنێوانیان. دابەشکردنی هەر مەبەستێکی شەرعی و دووبارە پلەبەندیکردنی (رەهای مەبەستی شەرعیی) لەو راستییە ناگۆڕێت کە بەژەوەندیی پەسەند بەپێی شەرع هەیە لە هەر مەبەستێکدا و لەنێوان مەبەستەکان و مەبەستەکانی تر سیستمی پەیوەندییەکی کراوە هەیە ناگۆڕێت و ویستراوی مەبەستەکانی بریتییە لە بەرژەوەندیی رەهای بەندەکان (مەبەستیی شەرعیی رەها)، نموونەش لەسەر چەندێتیی شێوازەکانی دابەشکردنی مەبەستەکان لە هەژمار نایەت و ئەم لێکۆڵینەوەیش نموونەیەکە لەسەر ئەوە.

هاواهەنگی (تناسق): هەر مەبەستێك ناکرێت دژیەکی تەواوی، یان کەمی مەبەستێکی تر بێت. هەر مەبەستێکی شەرعی، (رەهای مەبەستی شەرعی)، ناکرێت دژیەکی تەواوی یاخود کەمیی بەرژەوەندیی رەهای بەندەکان (رەهای مەبەستی شەرعی) بێت، نموونەش نییە لەسەر دژیەکیی نێوان شەرعی راست و جێبەجێکردنی روون.

## سیستمی پەیوەندیی دەرەکیی مەبەستە شەرعییەکان

لێرەدا جۆری دووەمی پلەبەندیی ئاستی پەیوەندییە مەبەستییەکان دەخەین روو، ئەویش ئاستی پەیوەندیی دەرەکییە: لەنێوان مەبەستە شەرعییەکان و گۆڕاوەکانی کات و شوێن و بار و کەسەکان، کە دەوروبەری مەبەستەکان دەگرێتەوە. سەرەڕای جۆری یەکەم و دووەمی پلەبەندیی سیستمی مەبەستەکان، کە ئەوانیش سیستمی کراوە و سیستمی داخراون.

حوکمە شەرعییە راستەکان یەك سیستمی تەواون، ئەمەش وا دەخوازێت پەیوەندی لەنێوان تاکەکانی حوکمی شەرعی و دەوروبەرەکەیان، سەرەتا بە بونیاد بێت لەسەر حوکمی خودا و کۆتاییشی بەو دەبێت. پەیوەندیی مەبەستەکان و دەوروبەرەکەیان هاوشێوە نین و لەسەرووشیەوە نییە، چونکە شەریعەتی خودا حاکمە بەسەر هەموو شتێکەوە و هەموو بەرژەوەندی و هەڵسوکەوت و ئامانجێك دەگرێتە خۆ و دابەش ناکرێت و لە هەموو کات و شوێن و بارێکدا کاری پێ دەکرێت، لەبەر ئەوەی پەیوەندیی نێوان مەبەستە شەرعییەکان و دەوروبەرەکەی پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتدار و خەڵکییە لەسەر شێوەیەکی دیاریکراو کە سەرجەم ئەوانە لەخۆ دەگرێت کە دەکرێت روو بدەن، بەم پێیەش لەسەر سیستمێکی کراوەی دوولایەنە دەوەستێت، چونکە لە لایەك سیستمێکی کراوەی رەهایە و لە لایەکی تر سیستمێکی داخراوی رەهایە و هەریەکەشیان شوێنێکی جیاوازی هەیە لەوی تر، بەم شێوەیە:

**جێگیری:** لایەنی کراوە لە شەریعەدا، سیستمێکی کراوەی رەهایە لەرووی کاریگەریی لەسەر واقیع، سیستمێکی داخراوی رەهایشە لە لایەنی کارتێکرانی لەلایەن واقیعەوە. لایەنی جێگیریی شەریعە کارتێکەرە و کارتێکراو نییە، لەبەر ئەمە داخوازیی بەدەستهێنانی مەبەستە شەرعییەکان لەسەر تاك و کۆمەڵ جێگیرە

و ناگۆڕێت بە گۆڕانی کات و شوێن بار و کەسەکان، چونکە دوورخستنەوەی خراپـە لە هەر پەرستن و خوویەك و بەدەستهێنانی بەرژەوەندی تێیـدا بـەپێی ڕێکارەکـانی بەرژەوەندی، فەرمانپێکراوە لە هەموو بارێك و بۆ هەموو کەسێك و لە هەموو کات و شوێنێك، جا بـە درێـژی بێـت (ڕەهـای بەرژەوەنـدیی بەنـدەکان)، یـاخود بـەکورتی (بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان).

**گشتگیری:** لایەنی گشتگیری لە شەریعەدا، سیستمێکی کراوەی ڕەهایە لە لایەنی کارتێکرانی بە پێکهاتەی بەرژەوەندییە پەسەندەکان وەك ئەوەی لە داکەوتدا هەیـە و سیستمێکی داخراوی ڕەهایە لە لایەنی حوکمی بەرژەوەندییە پەسەندەکان لەسەر واقیع. لەبەر ئەمـە دەبینرێت کـە لەپێشـینەییی نێـوان مەبەسـتە شـەرعییەکان لـە داخوازیـدا دەگۆڕێـت بـەپێی گۆڕانکـاریی جێبـەجێکردنی ڕەهـای بەرژەوەنـدیی بەندەکان بۆ بەرژەوەندیی ڕەهای بەندەکان.

لێرەدا ڕۆڵی بەرژەوەندی دەردەکەوێت بەڕوونی وەك هۆکارێکی سەربەخۆ، چـونکە بنەڕەتە لە گۆڕینی داخوازیی شـەرعی لەسـەر واقیـع و بنەڕەتیشـە لـە جێبـەجێکردنی حوکمی شەرعی لەسـەر واقیـع، هـەروەك ڕۆڵـی مەبەسـتە شـەرعییەکان دەردەکـەوێت بەڕوونی وەك شوێنکەوتوویەکی کارتێکراو بە پێکهاتەی بەرژەوەندییە پەسەندەکان لە داکەوتــدا، هــەروەها ڕۆڵــی دەوروبــەر(واقیع) دەردەکــەوێت وەك نێوەنــدگیرێك کــە ئەندازەگیریی بەرژەوەندیی پەسەندی پێ دەکرێت و کاریگـەریی دەبێـت لـە داخـوازیی حوکم، بۆیە واقیع نێوەندگیرێکە کاریگەریی بەرژەوەندیی پەسەند دەگوێزێتـەوە سـەر مەبەستە شەرعییەکان و لە لایەکی ترەوە ئەندازەگیریی بەرژەوەنـدیی جێبـەجێکردنی حـوکمی شـەرعی دەپێورێـت بـە بونیـاد لەسـەر واقیـع و دەوروبـەر نێوەنـدگیرە بـۆ گواستنەوەی کاریگەریی مەبەستی شـەرعیی پەیـدابوو لـە دەوروبـەر(واقیع)، بـە هـۆی گـۆڕانی کـات و شـوێن و بـار و کەسـەکان، بـە جۆرێـك داخـوازی بگونجێـت بـەپێی لەپێشینەی شەرعی، تا هەموو هەڵوێست و شتێك بگرێتەوە.

# هێڵکاریی پلەبەندیی مەبەستە شەرعییەکان



# ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە

ڕەنگـە باشـترین کۆتاییهێنانێـك بـۆ لێکۆڵینەوەکـە، خسـتنەرووی وەڵـامی پرسیارەکانی لێکۆڵینەوەکە بێت لـە چوارچێوەی بابـەتی مەبەسـتە شـەرعییەکان وەك ئـەنجامانێکی لاوەکـی، پاشـان هـەڵێنجانی ئەنجامـە گشـتییەکان لێیـەوە، بـۆ نموونە:

ئامانجـە لاوەکییـەکان: ئـەم بابەتـە خولگـەی وەڵـامی پرسـیارەکانی لێکۆڵینەوەکەیە، کە ئەویش:

- وەڵـام: ئایـا ئـەم پەیوەندییـە لەسـەر یـەك ئاسـتە، یـاخود لەسـەر ئاسـتی جیاوازە؟ بەم شێوەیەی خوارەوە:

✓ پەیوەنـدی لەسـەر ئاسـتی جیـاواز بـە (جـۆر)، جـۆرێکی نـاوخۆ لـەنێوان مەبەستەکان خۆیان و جۆرێکی دەرەکی لەنێوان مەبەستەکان و دەوروبەریان.

✓ پەیوەنـدی لەسـەر ئاسـتی جیـاواز بـە (پلـە)، ئاسـتی پەیوەنـدی لـەنێوان تاکـەکانی ڕەهـای مەبەسـتە شـەرعییەکان و ئاسـتی پەیوەنـدی لـەنێوان ڕەهـای مەبەستە شەرعییەکان و مەبەستی شەرعیی ڕەها.

- وەلأم: ئایا ئـەم پەیوەندییـە هەرەمییـە یـاخود ئاسـۆیی؟ جـێگیرە یـاخود گۆڕاو؟ بەم شێوەی خوارەوە:

✓ پەیوەنـدیی نێـوان ڕەهـای مەبەسـتە شـەرعییەکان و مەبەسـتی شـەرعیی ڕەها، پەیوەندییەکی هەرەمیی جێگیرە.

✓ پەیوەندیی نێوان تاکەکانی ڕەهای مەبەستە شەرعییەکان، پەیوەندییـەکی هەرەمییـە لـە ڕوویەکـەوە و ئاسـۆیییە لـە ڕوویـەکی تـرەوە، نـاجێگیر و گـۆڕاوە و دەگۆڕێت بە ئەندازە و پلەی بەرژەوەندییە پەسەندەکە تیایدا.

- وەڵام: ئایا ئەم پەیوەندییە بەپێی سیستمێکی کراوەیە، یاخود سیستمێکی داخراو؟ بەم شێوەیە خوارەوە:

✓ پەیوەندییەکە بەپێی سیستمێکی کراوەیە لەسەر ئاستی ناوخۆ، لەنێوان مەبەستەکان خۆیان.

✓ پەیوەندییەکە بەپێی سیستمێکی جووتەکی لەسەر ئاستی دەرەکی، کراوەیە لە رووی کارتێکردن لەسەر دەوروبەری مەبەستەکە و داخراو لە رووی کارتێکران لەلایەن دەوروبەری مەبەستەوە.

- وەڵام: کام لەم گۆڕاوانە سەربەخۆن و کامیان شوێنکەوتوون و کامیان نێوەندگیرن؟ کامیان زیاتر لە رۆڵێکیان هەیە؟ بەم شێوەیەی خوارەوە:

✓ بەرژەوەندیی پەسەند بەپێی شەرع، هۆکارێکی سەربەخۆیە: هەر ئەویش کاریگەریی راستەوخۆی هەیە کاتێك دەدرێتە پاڵ مەبەستە شەرعییەکان و سوودی هەیە لە ئەندازەگیری و راڤە و تێگەیشتنی ئەندازە و پلەی ئەو سوودەی دەگۆڕێت، لە تێڕوانین لە سەرەنجام و کاریگەری.

✓ مەبەستە شەرعییەکان شوێنکەوتوون لەو رووەی جێی پێوان و ئەندازەگیری و لێکۆڵینەوەن بۆ زانینی رێگە و هۆکارەکانی بەدەستهێنانیان و دروستییان لە داهاتوو.

✓ دەوروبەر و رەگەزەکانی لە شوێن و کات و مرۆڤ و بارەکان، ئەوە هۆکاری نێوەندگیر و بەیەکداچوون کە بە هۆیانەوە و لە رێیانەوە کاریگەریی بەرژەوەندییەکان دەگوێزرێتەوە سەر پێوانە و ئەندازەگیریی مەبەستەکان.

- وەڵام: ویستراوی مەبەستەکان (مقصود المقاصد) چییە، مەبەست لێی چییە و چۆن و بۆچی؟ رۆڵی مەبەستە پەسەندەکان چییە سەبارەت بە مەبەستەکان؟ بەم شێوەیەی خوارەوە:

- ✓ بەرژەوەندیی رەهای بەندەکان بریتییە لە ویستراو و مەبەستی مەبەستە شەرعییەکان و مەبەستی شەرعیی رەها، مەبەست و ویستراوی رەهای مەبەستە شەرعییەکانە.
- ✓ بەرژەوەندیی پەسەند، هەڵسەنگاندنی بنەڕەتیی مەبەستە شەرعییەکانە کە بە هۆیەوە پلەبەندی دەکرێت لەنێوانیان، کامیان پێش بخرێت بەسەر ئەوی تردا.
- ✓ بەرژەوەندیی باڵای بەندەکان بەرزترین سنوورە بۆ هەڵسەنگاندنی مەبەستەکان بە بەرژەوەندییە پەسەندەکان و ئەوەی لەخوار ئەمەوەیە، هەڵدەسەنگێنرێت لە سنووری رەهای بەرژەوەندیی بەندەکان.
- ✓ هەر کردارێکی مرۆڤ هەیە لە کرداری دڵ یاخود ئەندامەکان، ئەوا خودا شێوازێکی بۆ داناوە کە بتوانرێت بکرێتە بەرژەوەندی و بگەڕێتەوە بۆ بەندەکە، بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرێت لە دونیا و دوارۆژ.
- ✓ سەرجەم ئەحکامەکانی شەریعە لە راستیدا بەرژەوەندیی پەیوەستن پێکەوە بە ئامرازێکی رێك و پتەوی جێگیری نەگۆڕاو و سیستمێکی پتەو و جێگیر پێك دەهێنن.
- ✓ سەرجەم مەبەستە شەرعییەکان، هەریەکەیان سەر دەکێشێت بۆ ئەوی تر و بەدەستهێنانی هەر بەرژەوەندییەك سەر دەکێشێت بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی تر و لەدەستدانی هەر بەرژەوەندییەك سەر دەکێشێت بۆ لەدەستدانی بەرژەوەندیی تر.

سەرجەم ئەو کردەوانەی خودا خۆشی دەوێن، بەرژەوەندییە پەسەندەکانی دونیا و دوارۆژ لەخۆ دەگرێت و دەست دەکەوێت بە چاوەڕێی پاداشتکردن تێیدا لە رێی پەرستنەوە نەك لە رێی خووەوە.

## ئه نجامی گشتی

**ئەنجامی یەکەم:** مەبەستی باڵای خودا لە مەبەستەکان بریتییە لە: سوودی بەندەکان بەڕەهایی وەك سۆز و بەخشش، هەروەك پێویستی کردووە لەسەر خۆی و بێ ناچارکردنی لەلایەن بەندەکانەوە.

**ئەنجامی دووەم:** مەبەستی باڵای بەدیهێنان و یاسادانان بریتییە لە: بەجێگەیاندنی پەرستنەکان بۆ بەدەستهێنانی بەندایەتیی خودا.

**ئەنجامی سێیەم:** مەبەستە شەرعییەکان بریتین لە: "ئەو بەرژەوەندییانەی بەندەکان، کە لە پەرستنەکانەوە پەیدا دەبن."

## له کۆتایی

لە کۆتاییدا رەنگە قورسترینی ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیەدایە، وەڵامدانەوەی ئەوە بێت کە سوود و بەرهەمی لێکۆڵینەوەی پلەبەندیی مەبەستە شەرعییەکان چییە؟ بە روانین لە جیاوازیی تێڕوانینەکان سەبارەت بەوەی کە دروست وایە ناونانی بەرهەم یان سوود لە لێکۆڵینەوەی هەر بابەتێکی فیقهی و سوودەکان لە تێڕوانینی لێکۆڵەرەوە سێ جۆرە، ئەوانیش:

سوودە زانیارییانەکان(فوائد معرفية): زیادکردنی ئیعتباری نوێ یاخود پلەبەندی و بەکارهێنانی نوێ بۆ ئیعتبارەکانی پێشوو لە بواری مەبەستە شەرعییەکان، تێگەیشتنی زانیاریی نوێ زیاد دەکات کە سوودی هەیە لە تێگەیشتنی مەبەستە شەرعییەکان وردتر و زیاتر.

سوودە مەنهەجیەکان(فوائد منهجية): شێوازی کارلێککردنی مەبەستەکان لەگەڵ یەکتر و سیستمی پەیوەندیی نێوانیان لە لایەك و پەیوەندییان لەگەڵ دەوروبەریان لە لایەکی تر، سوودێکی مەنهەجی زیاد دەکات لە لێکۆڵینەوەی بابەتەکە و

کۆنترۆڵکردنی مەبەستە شەرعییەکان لە کاتی ئەندازەگیریی شتەکانی زیادکراو لەدەرەوە بۆ مەبەستەکان.

سوودی ڕێکاریی کرداری: ڕوونکردنەوەی ڕۆڵی بەرژەوەندی لە ڕێککردنەوەی ئەندازە و پلەی مەبەستە شەرعییەکان، سوودی ڕێکاری زیاد دەکات لە کاراکردنی کارکردن بە مەبەستە شەرعییەکان و پێوانە لەنێوانیان.

ئەمە ئەوە بوو کە خودا یارمەتیی داین لە نووسین و هێنانە پێشی و لە کۆتاییدا ستایشی خودای خاوەنی جیهانەکان دەکەین و درووود و ئاشتی بۆ سەر بەڕێزترینی پێغەمبەران، گەورەمان محەمەد و لەسەر یار و یاوەرانی هەموویان دەنێرین.

# سەرچاوەكان

- **سەرچاوە عەرەبییەكان:**


١ـ ابـو جيـب، سـعدي(١٤١٨هــ ١٩٩٨م) القـاموس الفقهـي لغـة واصـطلاحا، الطبعـة:دون، دمشق، دار الفكر.

٢ـ ابو سليمان، حمـد محمـد الخطـابي، شـأن الـدعاء، تحقيـق: احمـد يوسـف الـدقاق، دار الثقافة العربية، الطبعة الثالثة، ١٤١٢هـ ١٩٩٢م.

٣ـ ابن تيمية احمد بـن عبـد الحلـيم، ١٤١١هــ درء تعـارض العقـل والنقـل، الطبعـة الثانيـة، تحقيق: محمد رشاد سالم، الرياض، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، جزء ٣.

– ابــن تيميــة، السياســة الشــرعية، وزارة الشــؤون الإســلامية والاوقــاف والــدعوة والارشاد،المملكة العربية السعودية، الرياض، ١٤١٩هـ.

– ابن تيمية، ١٤١٩هـ كتاب العبودية، تحقيق: على حسن على عبد الحميـد الحلـبي، دار الاصالة ـ الاسماعيلية.

– ابن تيمية، الرد على المنطقيين، الطبعة الاولى، بيروت، دار الفكر اللبناني، ١٤١٣هـ ١٩٩٣م.

ـ ابـن تيميـة، القواعـد النورانيـة الفقهيـة، الطبعـة الثانيـة، الريـاض، مكتبـة المعـارف، ١٤٠٣هـ ١٩٨٣م.

– ابن تيميـة،بيان الـدليل علـى بطـلان التحليـل، تحقيـق: د.فيحـان المطـيري، الطبعـة الثانية، السعودية، مكتبة اضواء النهار، ١٩٦٦هـ.

– ابـن تيميـة والاسـتنجاد بـالمقبور، الطبعـة الاولى، طنطـا، دار الصـحابة للـتراث، دون تـاريخ النشر.

– ابن تيمية، فصول في اصول الفقه، جمع وترتيب: ابي الفضل عبد السـلام بـن محمـد بن عبد الكريم، الطبعة الثانية، القاهرة، المكتبة الإسلامية، ١٤٢٠هـ ٢٠٠٠م.

– ابن تيمية، مجموع فتاوى شيخ الإسلام ابن تيمية، جمع وترتيب: عبد الرحمن بن محمد بن قاسم، طبعة مجمع الملك فهد اطباعة المصحف الشريف، المدينة المنورة، وزارة الشؤون الإسلامية والاوقاف والدعوة والارشاد.

ـ ابن تيمية، اقتضاء الصراط المستقيملمخالفة اصحاب الجحيم، تحقيق وتعليق: ناصر بن عبد الكريم العقل، الطبعة الاولى، الرياض، مكتبة الرشد.

٤ـ ابن الخوجة، محمد الحبيب، بين علمي اصول الفقه والمقاصد، وزارة الاوقاف والشؤون الإسلامية، قطر، ١٤٢٥هـ ٢٠٠٤م.

٥ـ ابن السبكي، تاج الدين عبد الوهاب بن علي، جمع الجوامع، بيروت، دار الكتب العلمية، ٢٠٠١م.

٦ـ ابن عاشور، محمد الطاهر، مقاصد الشريعة الإسلامية، تحقيق: محمد الطاهر الميساوي، الكبعة الضانية، دار النفائس، عمان، ١٤٢١هـ ٢٠٠١م.

٧ـ ـ ابن عبد السلام، عبد العزيز، مختصر الفوائد في احكام المقاصد، تحقيق: صالح بن عبد العزيز آل منصور، ط١ الرياض، دار الفرقان، ١٤١٧هـ ١٩٩٧مـ

ـ ابن عبد السلام، القواعد الكبرى الموسوم بقواعد الاحكام في اصلاح الانام، تحقيق: نزيه حماد و عثمان ضميرية، الطبعة الاولى، دمشق، دار القلم.

٨ـ ابن فرحون، برهان الدين ابو الفداء إبراهيم بن محمد، تبصرة الحكام في اصول الاقضية ومناهج الاحكام، بيروت، دار الكتب العلمية، د.ت.

٩ـ ابن قدامة، موفق الدين عبد الله بن احمد، روضة الناظر وجنة المناظر، اعتنى به وعلق عليه، محمد مرابي، مؤسسة الرسالة ناشرون، دمشق ـ بيروت، الطبعة الاولى، ١٤٣٠هت ٢٠٠٩م.

١٠ـ الآمدي، الاِحكام في اصول الاحكام، تعليق: عبد الرزاق عفيفي، ط الثانية، بيروت ـ المكتب الإسلامي، ١٤٠٢هـ ـ ١٩٨٢م.

١١ـ ابن قيم الجوزية(٦٩١ه ـ ٧٥١هـ)مدارج السالكين بين منازل اياك نعبد واياك نستعين، دار الكتب العلمية، بيروت ـ لبنان ـ ط الاولى.

ـــ ابـن قـيم الجوزيـة، اعـلام المـوقعين عـن رب العـالمين، ط ١ بـيروت، المكتبـة العصـرية، ١٤٠٧هـ ١٩٨٧م.

١٢ـ ابن منظور ابو الفضل جمال الدين محمد بن مكرم بن منصور١٤١٤هـت ١٩٩٤م، لسـان العرب، ط ٣، بيروت، دار صادر. وطبعة دار احياء التراث العربي، بـيروت، ١٤٠٨هــ ١٩٨٨م الطبعة الاولى.

١٣ـ ابن المرتضـي، محمـد يحيـى بهـران الصـعدي، البحـر الزخـار الجـامع لمـذاهب علمـاء الامصار، تحقيق: محمد محمد تامر، الطبعة الاولى، بيروت، دار الكتب العلمية.

١٤ـ ابن هشام لبو محمد عبد الله الانصاري، ت٧٩١هـ، مغـني اللبيـب عـن كتـب الأعاريـب، تحقيـق: محمـد محـي الـدين عبـد الحميـد، ط الاولى، بـيروت، المكتبـة العصـرية، ١٤١١ه - ١٩٩١م.

١٥ــ الاسنوي، جمال الدين أبو محمد عبد الرحيم بن الحسن، نهاية السـول في شـرح منهـاج الوصول، القهرة، عالم الكتب، ١٤٤٣هـ.

١٦ـ الآبـي، صـالح عبـد السـميع المـالكي، اكمـال المعلـم شـرح مسـلم، بـيروت، دار الكتـب العلمية، ١٩٩٤م.

١٧ـ آل سعود، عبد العزيز بن سـطام، ١٤٢٦هــ اتخـاذ القـرار بالمصـلحة، الريـاض، جامعـة الإمام بن سعود الإسلامية.

١٨ـ ببزا، عبد النور، المقاصد الضرورية بين مبدأ الحصـر ودعـوى التغـيير، مجلـة اسـلامية المعرفة، السنة العاشرة، العدد٤٠، ربيع ١٤٢٦هـ ٢٠٠٥م.

١٩ـ البعلي، بدرالدين ابو عبد الله محمد بن علي بن اسبالار، الدرر المضية الفتاوى المصرية المسـمى مختصـر فتـاوى ابـن تيميـة. شـرحه وراجعـه مكتـب الدراسـات والبحـوث العربيـة الإسلامية، الطبعة الاولى، بيروت، دار القلم.

٢٠ـ البيضاوي، ناصرالدين عبد الله بن عمر، منهاج الوصـول الى علـم الاصـول، بـيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٨٤.

٢١ـ التفتازاني، سعدالدين بن مسعود، التلويح شرح التوضيح في كشف حقائق التنقيح، تعليق: محمد عدنان، الطبعة الاولى، بيروت، دار الارقم، ١٤١٨هـ ١٩٩٨م.
٢٢ـ الجرجاني، علي بن محمد السيد الشريف، معجم التعريفات الفقهية، تحقيق: محمد الصديق المنشاوي، الطبعة الاولى، القاهرة، دار الفضيلة للطباعة والنشر.
٢٣ـ الجويني، إمام الحرمين عبد الملك بن عبد الله، البرهان في اصول الفقه، الطبعة الاولى، المنصورة ـ مصر، دار الوفاء، ١٤١٢هـ ١٩٩٢.
٢٤ـ الحازمي، احمد عمر، شرح الاصول الثلاثة، المطول، الإمام محمد بن عبد الوهاب، تفريغ الشريط الخامس عشر، ص ٧ ـ ٨. منشور على موقع(www.alhazme.net الخميس ٢٢ آيار ٢٠١٤م.
٢٥ـ الخادمي، نورالدين بن مختار، ١٩٩٨م، الاجتهاد المقاصدي، حجيته، ضوابطه، مجالاته، الطبعة الاولى، قطر، وزارة الاوقاف والشؤون الإسلامية.
٢٦ـ خليل، سامي، ١٩٨٠م، مباديء الاقتصاد الكلي، الطبعة الاولى، الكويت مؤسسة الصباح.
٢٧ـ الرازي، فخرالدين محمد بن عمر بن الحسين، المحصول في اصول الفقه، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٨٨م.
٢٨ـ الزبيدي، محمد مرتضى الحسيني، تاج العروس من جواهر القاموس، الطبعة الاولى، تحقيق: عبد الكريم العزباوي، راجعه: ممصطفى حجازي، الكويت، مطبعة الحكومة، ١٤١٠هـ ١٩٩٠م.
٢٩ـ الزرقا، مصطفى أحمد، ١٤١٩هـ ١٩٩٩م، المدخل لنظرية الالتزام في الفقه الإسلامي، دمشق، دار العلم.
٣٠ـ الشاطبي، إبراهيم بن موسى بن محمد اللخمي، الموافقات، الطبعة الاولى، السعودية، الخبر، دار ابن عفان، ١٤١٧هـ ١٩٩٧م.
٣١ـ الشوكاني، محمد بن على بن محمد، ١٤١٤هـ ١٩٩٤م، فتح القدير، الجامع بين فني الرواية والدراية من علوم الحديث، ط ١، المنصورة، مصر، دار الوفاء.
ـ الشوكاني، إرشاد الفحول، تحقيق: ابو مصعب محمد سعيد البدري.

٣٢ـ الشيرازي، ابو إسحق إبراهيم، شرح اللمع، تحقيق: عبد المجيد التركي، ط الاولى، دار الغرب الإسلامي،١٤٠٨هـ ١٩٨٨م.

٣٣ـ الطوفي، نجم الدين بن سليمان بن عبد الكريم، شرح مختصر الروضة، عبد الله عبد المحسن التركي، ط١ بيروت، مؤسسة الرسالة، ١٤٠٨هـ ١٩٨٨م.

ـ الطوفي، التعيين في شرح الأربعين، تحقيق: أحمد حاج محمد عثمان،ط١ بيروت، مؤسسة الريان، ١٤١٩هـ ـ ١٩٩٨م.

٣٤ـ عبد الحميد، محمد محي الدين، ١٣٧٨هـت ١٩٥٨م، رسالة الآداب في آداب البحث والمناظرة، الطبعة السابعة، المكتبة التجارية الكبرى

٣٥ـ عبد الرحمن، طه، مشروع تجديد علمي لبحث مقاصد الشريعة، مجلة المسلم المعاصر، العدد١٠٣، ١٤٢٢هـ ١٩٩٢م.

٣٦ـ العثيمين، محمد بن صالح، القول المفيد على كتاب التوحيد، تحقيق سليمان بن عبد الله بن حمود ابالخيل، وخلد بن على بن محمد المشيقح، ط الاولى، دار العاصمة، ١٤١٥هـ

٣٧ـ العزاوي، فارس، مدخل الى علم المقاصد، (١ـ٥) www.alukah.net/sharia.
PM> 14 May١٢:٤٦.

٣٨ـ العلواني، طه جابر، مقاصد الشريعة، بيروت، دار الهادي، ٢٠٠١.

ـ العلواني، طه، التوحيد والتزكية والعمران، محاولة في الكشف عن القيم والمقاصد القرآنية الحاكمة.

٣٩ـ الغزالي، ابو حامد محمد بن محمد(ت:٥٠٥هـ)المستصفى في علم الاصول، تحقيق: حمزة زهير حافظ، شركة المدينة المنورة للطباعة.

٤٠ـ الفوزان، صالح بن الفوزان، شرح رسالة العبودية لشيخ الإسلام ابن تيمية، اعتنى بها: فهد إبراهيم الفعيم، الطبعة الاولى، ١٤٣٥هـ دار ابن الجوزي، الرياض،

٤١ـ الفيروزآبادي، القموس المحيط.

٤٢ـ الفيومي ابو العباس احمد بن محمد بن علي الفيومي الحموي، المصباح المنير في غريب الشرح الكبير ، مادة(ا،ص،ل)، مخطوط، المكتبة الأزهرية، نسخ، عبد البر بن محمد ابو اليسر السيوطي، بتاريخ١٠٩١هـ.

٤٣ـ فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء، جمع وترتيب: احمد بن عبد الرزاق الدويش، المجموعة الاولى: العقيدة، الإيمان بالقضاء والقدر، التسيير والتخيير في ضوء الكتاب والسنة، فتوى رقم٤٦٥٧، دار المؤيد، الرياض.

٤٤ـ القرافي، شهاب الدين احمد بن ادريس، شرح تنقيح الفصول في اختصار المحصول، بيروت، دار الفكر، ١٩٧٣م.

ـ القرافي، ١٤٠٤هـ ١٩٨٤م، الأمنية في ادراك النية، ط الاولى، بيروت، دار الكتب العلمية.

ـ القرافي، الذخيرة، الطبعة الاولى، بيروت، دار الغرب الإسلامي، دون سنة الطبع.

ـ القرافي، الفروق أو انوار البروق في انواء الفروق، ضبطه وصححه: خليل المنصور، الطبعة الأولى، بيروت، دار الكتب العلمية.

ـ القرافي، نفائس الاصول في شرح المحصول، تحقيق: علي محمد معوض وعادل احمد عبد الموجود، ط الثالثة، بيروت، المكتبة العصرية، ١٤١٩هـ ١٩٩٩م.

٤٥ـ الكيلاني، عبد الرحمن بن إبراهيم، قواعد المقاصد عند الإمام الشافعي، عرضا ودراسة وتحليلا، دمشق، دار الفكر.

٤٦ـ اللخمي، رمضان عبد الودود، ١٤٠٧هـ ١٩٨٧م. التعليل بالمصلحة عندالاصوليين، ط الاولى، القاهرة، دار اللهدى للطباعة.

٤٧ـ المباركفوري، الشيخ صفي الدين(١٤٢٠هـ ٢٠٠٠م)المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ط الثانية، الرياض، دار السلام.

٤٨ـ محمد، علي جمعة، المدخل الى دراسة المذاهب الفقهية.

٤٩ـ مخدوم، قواعد الوسائل، نقلا عن ابي بكر بن عاصم الاندلسي، الذي اختصر كتاب الموافقات ونظمه في نيل المنى و في منزومته (مرتقى الوصول).

٥٠ـ المرادي، الحسن بن ام قاسم(١٤١٣هـ ١٩٩٢م)الجني الداني في حروف المعاني، تحقيـق: فخرالدين قباوة و محمد نديم فاضل، ط الأولى، بيروت، دار الكتب العلمية،
٥١ـ المنجور، احمد بن على المنجور، شرح المـنهج المنتخـب الى قواعـد المـذهب، دراسـة وتحقيـق: محمد الشيخ محمد الامين، ط١، القاهرة، مكتبة ومطبعة دار الكتب العلمية، دون سنة الطبع.
٥٢ـ مسلم بن الحجاج القشيري النيسابوري(د، ت،ن)صحيح مسلم، محمد فؤاد عبد البـاقي، بيروت، دار احياء التراث العربي.
٥٣ـ هيتو، محمد حسن، الوجيز في اصول التشريع الإسلامي.

- **سەرچاوە بیانییەکان:**

1- Bbarson, J@Heinich,R.The sestem approach to instruction, davi 1966Convention, San Deigo(audiotape).Boulder: National Tape Rrepository, University of Colorado. Also reported in the system , Auiovisual instruction. 1966> 11. 431 - 433.
2- Bern,H. A. Wanted: Educational engineers Phi Delta Kappan, 1967, 48, 230 – 236.
3- Corigan, R, E, Kaufman, R. A. Why System engineering. Palo Alto, Calif. Fiaron 1966.
4- Eldridge, Maxims for a modern man. Carnbury, N,j, : A. S. Barnes. 1965.
5- Kaufman, R, A, Corrigan, R.E. Corrigan. B. O. & Goodwin, D,L. Steps and Tools of system analysis in education, functional analyses in education, Task analyses in education, Methods- means analyses in education, An interim generic probles solving model, An exercise in the analyses of planned change in education, (Eight pamphlets prepared for operation PEP)San mateo Clif.: San Mateo County Department of Education, 11967.
6- Mauch, J A systems analyses approach to education, Phi Delta Kappan.1962, 43, 158 – 1161.
7- Silvern, L, C, Cybernetics and education, K-12 Audiovisual, 1968, 13, 267 0175.

- **پێگە ئەنتەرنێتییەکان:**

1- Systemhhttp://en. Wikipedia.org./wiki/open –system- 28% systems-thiory29%

2- http://en.wikipedia.org/wiki/Closed-system.

3- http://en.wikipedia.org/wiki/Isolated-system.

4- www.alukah.net/sharia31.58.